# القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى

تأليف

فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين

# بنەماکانی تێگەیشتن لە سیفاتەکانی خوای گەورەو ناوەجوانەکانی

وەرگێرانی

غازی حەمە أمین

# بنەماکانی تێگەیشتن
# لە
# سیفەتەکانی
# خوای گەورە و ناوە جوانەکانی

نووسینی
شێخ موحەممەد ئیبن صاڵەح ئەلعوسەیمین

وەرگێڕانی
غازی حمە ئەمین

١٤٢٥ ك چاپی یەکەم ٢٠٠٤ ز

ناوی کتێب: بنەماکانی تێگەیشتن لەسیفەتەکانی خوای گەورە و ناوە جوانەکانی

نووسیتی : شێخ مەحەممەد ئیبن صالەح ئەلعوسەیمین

وەرگێڕانی : د. غازی حمە ئەمین

ساڵی چاپ : ٢٠٠٤ ز ١٤٢٤ ك

ژ. مۆڵەت : (        ) ساڵی (٢٠٠٤) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

تیراژ : ٥٠٠٠ دانە

# ووتەیەك

لەئایینی گشتگیرو سەروەری ئیسلامدا عەقیدەو ئیمان پایەو بناغەیە بۆ گشت دروشمـەكانی تـرو باڵی دووەمـی پێكهێنـەری ئـەم ئـایین و ﴿ شـــەریعەتە ﴾ یـە، كـەزانایانی شـەرع نـاس دەفەرموون (الاسلام عقیدە و شریعە) دیارە هیچ عیبادەت و حوكم و دروشمێكی ئەم شـەریعەتە كـە ئـەنجام بدرێ خـوای گـەورە لـە بـەندەكانی قـەبوڵ ناكـات گـەر لەسـەر بناغـەی عـەقیدەی ئیسلامی و ئیمان پێ بوونـی تـەواویان نـەبێت كەواتـە ئـەركی سەرشـانی هـەموو موسـوڵمانێكی خوێندەوارە پێش ئەنجام دانـی هـەر عیبـادەت و دروشمێكـی ئیسـلامی هـەوڵی تـەواو بـدات بـۆ شارەزا بوون لەعەقیدەو ئیمان لەبەر دوو هۆی سەرەكی:

١-بەمەبەستی قەبوڵ بوونی عیبادەتەكانی لای پەروەردگار و بۆ ئـەوەی (دافـع) پاڵنـەر بـۆ ئەنجامدانی هەر عیبادەتێك (ئیمان)بوون بێت بەخوای باڵادەست و چوونە بەهەشت نـەك پاڵنـەر تەماح یا ترس یا چاولێكەری.....هتد بێت.

٢-سیفەتی (بـەردەوام بـوون) لەسـەر ئیسـلامەتی بەتەنـها شـارەزایی لـە ئیمـان و عـەقیدە دروستی دەكات، دەنا رۆژانە بەچاوی خۆمان چەندەها موسوڵمانمان بینیوە لەبەر نەشارەزاییان لەئیمان وعەقیدە، بەسـادەترین تـاقی كردنـەوە و تـەماح و پلـە و پایەیـەكی دونیـایی چۆكیـان داداوە و توشی ترازان و هەڵدێر هاتوون پەنا بەخوا.

جا یەكەمین پایەش لە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی باوەڕ بوونە بەزاتی گـەورەی خـوا (ﷻ) لەگەڵ ناوە جوانەكانی وسیفاتە بەرزەكانیدا و پەیوەسـت بوونـە بـە مانـاو مەبەسـتی ئـەو نـاوو سیفاتانەوە و لەڕوانگـەی هـەر نـاوێكی پـیرۆز وسـیفاتێكەوە گـەورەیی و دەسـەڵات وحیكمـەتی پەروەردگارمان بۆ دەردەكەوێت و ئەوكات لەزەت لە ژماردن و وتنـەوەی ناوەكـانی خـوا رۆژانـە وەردەگرین و لەگەڵیاندا دەژین و ئاوێتەی هەست و سۆز و بیرو هۆشمان دەبێت و لەو حاڵەتـەدا پێغەمبەری پێشەواشمان بە ووتنـەوەی ئـەو نـاوە جـوان و پیرۆزانـە مـوژدەی بەهەشـتمان پـێ

دەدات وەك دەفەرموێ ﴿إن لله تسعة وتسعين إسماً مائـة إلا واحداً من أحصاها دخل الجنـة﴾ واتە: خوای گەورە نەوەدونۆ ناوی هەیە، سەد ناو جگە لەیـەك دانـە، هەرکـەس وەك ئیمـان پـێ بوون و زیکر بیان خوێنێت دەچێتە بەهەشتەوە.

ئەم کتێبەش بەشێوەیەکی زانستی و بابەتیانە ولەسەر ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت وجەماعەت توێژینەوە لەسەر ڕوکنی یەکەمی ئیمان و بەتایبەت (نـاوو سیفەتەکانی پـەروەردگار) دەکات و پێم وایە(کتێبخانەی کوردی) و موسوڵمانانی هاوزمانم زۆر پێویستیان بـەوەها کتێبێك هـەبێت و ئومێدەوارم کەلێنێکی باش لە بواری مەنهەجی ئیسلامی پڕبکاتەوە و دەلیلێك بێت بـۆ (دروست شارەزا بوون) لە ناو و سیفەتە جوانـەکانی پـەروەردگار وگـوڕ و تینێك ببەخشێت بەعـەقیدە و ئیمانی شوێن کەوتوانی ڕابوونی ئیسلامی کوردستان و بیرکردنەوە و هەڵسو کەوتمان لە بازنـەی ڕەزامەندی خوای تەعالا بێت و لەبەر خاتری ناوە جوان و سیفاتە بڵند و بـەرزەکانی خـۆی ئـەم نوسین و وەرگێڕانەش لەئێمە قەبولْ بفەرموێت و بەبەهەشتی خۆی شادمان بکات اللهم آمین.

وەرگێڕ
٢٨/شوال/١٤٢٣هـ
٢٠٠٣/١٢/٢٣
هەڵەبجە

# پێشەکیەك

## لەلایەن زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز ئیبن بازەوە

سوپاس وستایش بۆ خوای میهرەبان و صەلات و سەلامیش لەسەر پێغەمبەر و درورد وسلاویش لەسەر یار و یاوەرانی وشوێن کەوتوانی.

پاشان:

دوای گوێ گرتنی وورد و شارەزابوون و هەڵسەنگاندنم بۆ ئەم نامیلکەی کەبرای بەڕێزمان شێخ (محمد العثيمين) داینـاوە بەناوی (القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى) بۆم دەرکەوت کە پەراوێکی گرنگ و بە پێزەو لەسەر ڕچەو تێگەیشتن و عەقیدەی پێشینانی ئەم ئوممەتە دارێژراوە لەتێگەیشتنیان بۆ سیفەت وناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە.

هەروەها ئاماژە بۆ کۆمەڵە بنەمایەکی گەورە وچەندەها وانەی گرنگ لەباسی سیفەت و ناوە پیرۆزەکاندا دەکات لەگەڵ ڕوون کردنەوەی ئاشکراو بێ تەم و مژی مانـای (معية) واتە (لەگەڵ بوون)ی خوای گەورە بۆ بەندەکانی بەمانا تایبەتی و گشتیەکانی کەلە قورئـانی پیرۆزو تێگەیشتنی ئەهلی سونەت و جەماعەتدا هاتووە و مەبەست پێی (لەگەڵ بوون)ی حەقیقیە بەو شێوەی کە لەگەڵ گەورەیی و دەسەلآتی خوادا بگونجێ بەبێ تێکەڵبوون و شوبهاندن بە تواناو دەسەلآتی هیچ جۆرێك لە دروست کراوەکانی خوای بالآدەست.

بەڵکو خوای گەورە وەك خۆی دەفەرموێت لەسەر عەرشی خۆیەتی ، بەوشێوەیەی کە لایەق بێت بەگەورەیی و دەسەلآتی خۆیەوە ، با ژیری ئێمەش دەرك بەچۆنێتی یەکەی نەکات.

بەلآم دەبێ بزانین ( لەگەڵ بوون )ی خوای گەورە بۆ بەندەکانی بە عیلم و زانیاری و چاودێری ورد و درشتی خوای گەورە دەبێت ، لەسەر هەموو ووتە و کردار و حاڵەتێکی بەندەکانی ، کەچی دەکەن و چۆن دەجوڵێنەوە و مەبەستیشیان لە ووتەو کردارەکانیان کێ یە؟! هەروەها لەگەڵ بوونی خوای گەورە بۆ پێغەمبەران و خواناسان بریتیەلە پشتگرتن و

تــەوفیق دانیــان بـۆ کارەکانیــان کــە هــەموو مانـا تاییـەت و گشـتیەکانی لەگـەڵ بـوون -معیــة- دەگرێتەوە.

هــەروەها ئــەم پــەراوە ئامــاژەی گرنگــی بــۆ حەقیقەتــە جێگیرەکــان ، ســەبارەت بــەناوو سیفاتەکانی خوای گەورە ، تێدایە و بەرپەرچی هەموو کۆمەڵە گومراکان دەداتەوە لە تاقمەکانی ئەهلی (تعطیــل) واتــە ئــەو کۆمەڵــەی کــە نــاوو سیفاتەکانی خــوای گــەورە ڕادەگرن یـا ئــەهلی (تشـبیه) واتــە ئەوانــەی نــاوو سیفاتی خــوای میــهرەبان دەشـوبهێنن بەعەبدەکانــەوە ، خـــوای میـهرەبان پاداشـتی خـێری بـرای نووســـەر بداتـــەوە و زیــاتر عیلــم و هیدایــەت و تــەوفیقمان پێببەخشێت و ئەم پەڕاوەش سـوودمەند بکات بۆ خوێنەران و موســوڵمانان بــەگشــتی وصلــی الله و سلم علی نبینا محمد وآله وصحبه.

٥/١١/١٤٠٤هـ

عبدالله بن عبدالعزیز بن باز

سەرۆکی گشتی بۆ بەڕێوەبردن و

توێژینەوەی زانستی و فەتواو بانگەواز

# پێشەكی

## بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

الحمدلله نحمده و نستعينه و نستغفره و نتوب اليه و نعوذ بالله من شرورأ نفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهدْالله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادى له وأشهد أن لاإله إلاالله وحده لاشـريك لـه و أشهد أن محمداً عبده و رسوله صلى الله عليه و على أله و أصحابه و مـن تبعـهم بإحسـان وسلم تسليما

پاشان:

باوەڕبوون بەناوو سیفاتەكانی خـوای میـهرەبان یەكێكـە لەڕووكنـەكانی بـاوەڕبوون بـەخودا كەبریتیە لە باوەڕبوون بەبوونی خـواو بـاوەڕبوون بـە پـەروەردگارێتی و یەكتاپەرسـتی خـوای تعـالی و هـەروەها بـاوەڕبوون بەسـیفات و ناوەپـیرۆز وجوانـەكانی كەیەكێكـە لەسـێ بەشـەكەی یەكتاپەرسـتی خـودا، ئـەویش یەكتاپەرسـتی یـە لـە پـەروەردگارێتی و پەرسـتش و نـاوو سیفاتەكاندا.

كەواتـە پلەوپایـەی یەكتاپەرسـتی خـودا لـە نـاوو سیفاتەكانیدا فەزایـەكی زۆر فراوانـی لـە ئیسلامدا گرتـووە و هیـچ كەسـێك ناتوانێ‌بـەڕێك و دروسـتی خواپەرسـتی بكـات ، تاشـارەزایی نـەبێت لەسـیفات و نـاوە جوانـەكانی خـوادا ،وبـەو شـارەزاییە چـاو ڕۆشـن دەبێتـەوە، خـوای بالآدەستیش دەفەرموێ لە سورەتی ئەعراف و ئایەتی (١٨٠) (ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها) (واتە: خوای میـهرەبان خـاوەنی چـەندەها نـاوی جوانـەو بـەو نـاوە جوانانـەی لێی بپاڕێنـەوە) ئەمەش دوعای داواكردن و دوعای عیبادەت دەگرێتەوە .

دوعای داواكـردن:— واتـە : هاوكـات لەگـەڵ پاڕانـەوەو داواكاریـەكانت لەپـەروەردگار نـاوێك لەناوە جوانەكانی خودا كەبگونجێ پێش بخە وەك ئەوەی كە بڵێیـت یـاغفور إغفـرلی واتـە: ئـەی

ئەو زاتەی کە لە گوناهەکان خۆش دەبیت لەمنیش خۆش بە ویا رحیم إرحمـنی واتـە: ئـەی ئـەو زاتەی کە زۆر بەبەزەیت ، ڕەحم و بەزەییش بە من بکە ، و یـا حفیـظ احفظـني واتـە: ئـەی ئـەو زاتەی کە دروستکراوەکانی خۆت دەپارێزیت منیش بپارێزە ..... هتد.

دوعای عیبادەت:- واتە، خوای گەورە بپەرستە لەڕوانگەی ماناو مەبەستی ناوەکانیەوە، بۆ نمونە گەڕانەوە و تۆبەکردنت بۆ لای خودا لەبەر ئەوەی یەکێك لەناوەکانی (التواب)ە وەبەزمانت یادی پەروەردگارت بکە چونکـە یـەکێك لـە ناوەکـانی (السـمیع) واتـە بیسـەری هـەموو داواکانـە هەروەها هەموو کاتێك بە ئەندامەکانی لەشت بیپەرستە چونکە (البصیر)ە واتـە بینـەری هـەموو دروستکراوەکانێتی، وەلە خودا بترسە لەنهێنیدا چونکە (اللطیف الخبـیر)ە وە ئاگـاداری هـەموو کردەوەو حاڵەتێکی پەنهانی یە کە بەندەکانی ئەنجامی دەدەن.....هتد.

جا لەپێناو بەرزی پلە و پایەی ناو و سیفەتە پیرۆزەکانی پــەروەردگار لـە ئیسـلامدا ولەبـەر ئەوەی کە خەڵك هـەندێ جـار بەحـەق و هـەندێك جـاریش بەنـەزانی و دەمارگـیری قسـەی تێدا دەکەن،پێم خۆشە لـە ڕوانگـەی چـەند بنەمایەکـەوە لەسـەر ئـەم بابەتـە بنوسـم و دەپاڕێمـەوە لـەخوای باڵادەست کـە ئـەم کـارەم تەنـها بـۆ خـۆی بێـت و سـود وکـەڵکیش بــە موسـوڵمانان بگەیەنێت. لەژێر ناونیشانی ﴿القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى﴾.

# بنەماكانی تێگەیشتن لە ناوەكانی خوای گەورە

## بنەمایی یەكەم:

ناوەكانی خوایی گەورە هەموویان جوان وپیرۆزن (حسنی) واتە كۆتا پلەی جوانی و چاكی وەك خوایی میهرەبان دەفەرمویّ ﴿ و لله الاسماء الحسنی﴾ سورەتی الأعراف ئایەتی(١٨٠) ، واتە: بۆخوای گەورە جوانترین و چاكترین ناو هەیە. كە لە هیچ ڕوویەكەوە نوقسانی و كەم و كوڕی هەڵناگرێت. بۆ نموونە (الحي) كە ناوێكە لە ناوەكانی پەروەردگار مانای ژیانی تەواوی تێدایە كە هەرگیز كاتێك نەبووە، نەبووبێت و لە ئێستا و داهاتویشدا لە ناو ناچێت ، ئەو ژیانەی كە هەموو سیفەتە تەواوەكانی وەك عیلم و دەسەڵات و بینین و بیستن و... هتد. لە خۆدەگرێت.

نمونەیەكی تر (العلیم) كەناوێكە لەناوە موبارەكەكانی خودا و مانای عیلمی تەواو دەبەخشێت بە ئەندازەیەك كە هەرگیز نەبووە نەزانین ، یا لەبیرچوونی لەگەڵدا بوبێت ، وەك پەروەردگارمان دەفەرموێت (علمها عند ربي فی كتاب لا یَضِلّ ربي ولا یَنْسَی) سورەتی (طه) ئایەتی (٥٢). واتە: هەموو كردەوەیەكی مرۆڤەكان لای پەروەردگار پارێزراوە لە(لوح المحفوظ) داو یاداشتیان لەسەر دەدرێتەوە و پەروەردگار هیچ شتێكی لیّ وون نابێت و لەیاد ناچێتەوە.

زانیاری خوای گەورە وورد ودرشتی ئەم بونەوەرەی گرتۆتەوە ، چ كارو كرداری خۆی بێت یا كرداری بەندەكانی وەك دەفەرمویّ: (وعندہ مفاتح الغیب لا یَعلمُها إلا هو ویَعلم ما فی البَّر والبحر وما تَسقُط مِن وَرقة إلاّ یعلمُها ولا حَبّةٍ فی ظُلمتِ الأرضِ ولا رطبٍ ولا یابسٍ إلاّ فی كتابٍ مُبین) سورەتی ئەنعام ئایەتی (٥٩) واتە: كلیلی خەزێنەكانی غەیب تەنها لای پەروەردگارە و كەس نایزانێت جگە لەزاتی خودا ، تەنها ئەوە دەزانێت چی لە وشكایی و دەریاكاندا هەیە و ئاگادارە بە وەرینی گەڵای درەختەكان لە كات و شوێنی دیاری كراودا ، شوێنی دانەوێڵەكان

لەسکی زەویدا و هەموو دروست کراوێکی خاوەن گیان و ووشك ، هەموویان لە (لوح المحفـوظ)دا تۆمار کراون و خوای زانا و بەدیهێنەریان تەواو شارەزایی لەبارەیانەوە هەیە.

هەروەها لە سورەتی (هود) ئایەتی (٦) دادەفەرموێت: ﴿وما مِـن دابَّةٍ في الأرضِ إلأعلىٰ الله رزقها ويَعلَمُ مُستقرَّها ومُستودَعها كلٌّ في كِتابٍ مُبين﴾. واتە: هیچ گیانلەبەرێك نی‌یە مەگەر ڕزق و ڕۆزی یەکەی، لەسەر خـوای بەخشـندەیە و دەزانیـت شـوێنی‌جێگیر بـوون و ژیـانی لەکوێدایـە و هەروەها شوێنی مردنیشی،ئەمانە هەمووی لای پەروەردگار لە(لوح المحفوظ)دا تۆمارکراون.

بەهـەمان شـێوە لـە سـورەتی (تغـابن) ئایـەتی (٤) دا دەفـەرموێ: ﴿يعلـم مـا في السـموات والأرض ويعلم ماتُسِرّون وما تُعلنون والله عليمٌ بذاتِ الصُّدور﴾. واتە:خوای گەورە دەزانێ چی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە و هیچی لێ وون نـابێت وئاگـادارە لـە هـەموو کـار و کردەوەیـەك کـە بەنهێنی یان بە ئاشکرا ئەنجامی دەدەن و خوای میهرەبان زۆر ئاگـادارە بـەوەی لـە دڵـەکاندا شاردراونەتەوە.

نموونـەی سـێهەم: (الرحمـان)ناوێکـە لـە نـاوە جوانـەکانی پـەروەردگار و مانـــای تـەواوی ڕەحمەت دەبەخشێت کە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەیـەوە دەفـەرموێت: ﴿لله أرحَمُ بعبـادِه مِنْ هـذه بوَلَدِها﴾. واتە:خوای میهرەبان زۆر بە ڕەحم ترە بەرامبەر بـەندەکانی خـۆی لـەو ئافرەتـەی کـە منداڵەکـەی وون دەبـێ وپاشـان دەیبینێتـەوە وباوەشـی پێـدا دەکـات و شـیری دەداتـێ، هەروەها(الرحمن) مانای ڕەحمەتی فراوانی خودا دەگرێتەوە بۆ سەرجەم دروسـتکراوەکانی وەك لە سورەتی ئەعراف ئایەتی (١٥٦)دا دەفـەرموێ (ورَحمَتي وَسِعَت كُلَّ شيءٍ) واتـە: ڕەحمـەت وبەزەیی من بڵاوبۆتەوە بەسەر هەموو درووستکراوەکاندا و کەسی لێ بێبەش نابێت.

وەك لە سورەتی غافر ئایەتی (٧) دا سەبارەت بـە دوعـا ونـزای فریشـتەکان بـۆ ئیمـانداران دەفەرموێ (رَبَّنا وسِعْتَ كلَّ شَيءٍ رحمةً وعِلماً) واتـە:پـەروەردگارا ، ڕەحمـەت و زانیـاری تـۆ سەرجەم دروستکراوەکانی گرتۆتەوە و هیچ شتێك نـی یـە لـە چوارچێوەی رەحـم و زانینـی تـۆ بەدەر بێت. پـیرۆزی وچـاکی وجوانـی لـەناوەکانی خـوادا یەکەیەکـەیان دەگرێتـەوە وکـاتێکیش دووناو پێکەوە کۆبکرێنەوە چاکترو جوانتر دەردەچن ومانـای (کمـالٌ فَـوقَ کمـال) وەردەگـرن و دەدرەوشێنەوە.

نمونەیەکی تر، ناوەکانی (العزيزُ الحكيم) لەقورئاندا پێکەوە هاتوون و هەریەکەیان دەلالەت لەسەر مانای (كمالٌ خاص)ی خۆی دەکات و لەناوی (العزيز)دا عیزەتی تەواوی لێ وەردەگیرێ و لەناوی (الحكيم)دا حوکم وکار بەجێیی پیشان دەدات وەلە کۆکردنەوەی هەردوو ناوە پیرۆزەکەدا ئاماژە بۆ(كمال) و تەواویەکی تر دەکات ئەویش ئەمەیە کە:

عیزەت و بالآدەستی خوای گەورە تێکەڵ بووە بە حیکمەت و کاربەجێی یەوە و عیزەتەکەی وای لێ ناکات زوڵم و ستەم ئەنجام بدات، هەروەك چۆن لەناو مرۆڤەکاندا کەسێ نەبووە بە خاوەنی دەسەلآت و عیزەت و زوڵم وستەم و خراپەکاری لێ نەوەشێتەوە! هەروەها حوکم و حیکمەتی خوای بالآدەست شێلراوە بە(العز الكامل) واتە عیزەتی بێ سنوور و کامڵ، بەپێچەوانەی حوکم و حیکمەتی ئینسانەکان کە زۆرجار دووچاری زەلیلی وبێ دەسەلآتی دەبنەوە.

**بنەمای دووەم:**

ناوەکانی خوا (ﷻ) ناون بۆ زاتی پەروەردگار لە هەمان کاتدا سیفەتیشن بۆی.

ناوەکانی خوا (ﷻ) ناون بۆ زاتی –الله– لەڕووی ئەوەوە کەهەموو ناوەکان ئاماژەو بەڵگەن بۆ زاتی –الله– سبحانه وتعالى. هەروەها ناوەکان سیفەتیشن لەڕووی ئەوەوە کە هەناوێك مانایەکی تایبەت دەبەخشێت وەك ناوەکانی (الحي، العليم، القدير، السميع، البصير، الرحمن، الرحيم، العزيز، الحكيم) هەموویان ناون بۆ زاتێك کە (الله)یە (ﷻ). بەلآم مانای (الحي) زیندوو، جیایە لە مانای (العليم) واتە:زۆر زانا و بەئاگا کە هیچی لێ وون نابێت ، هەروەها مانای (العليم) جیاوازە لە مانای (القدير) واتە زۆر بە توانا و دەسەلآت...هتد.

بۆیەش دەڵێین ناوەکانی خودا (ﷻ) ناویشن و وەسف و سیفەتیشن چونکە قورئان ڕاشکاوانە دەفەرموێت (وهو الغَفورُ الرَّحيم) سورەتی یونس ئایەتی (١٠٧)، واتە: خوای میهرەبان خاوەنی لێبووردەیی و بەزەیی یە، وە لەسورەتی کەهف ئایەتی (٥٨)دا دەفەرموێت (وربك الغَفُور ذُو الرَّحمة) واتە: پەروەردگاری تۆ لەبەندەکانی خۆشدەبێ و خاوەنی رەحمەت و بەزەییە، کەواتە ئایەتی دووەم بەڵگەو ئاماژەی بۆ ئەوە تێدایە (الرحيم) کە یەکێکە

لەناوەکانی خودا سیفەتی رەحمـەت هـەڵدەگرێت.. ئـەوەتا بـەپێی عورف و بە کۆی دەنگی زانایانی زمانناسی عەرەبی ئەوەیە کە: بە هیچ کەسێك نـاوترێت (علیم) هـەتا عیلم و زانیاری نەبێت وە ناوترێت (سمیع) ئەگـەر (سمع) بیسـتنی نـەبێت وە نـاوترێت (بصیر) واتـە بینـەر ئەگەر (بصر) بینینـی نـەبێت ئـەم بابەتـەش ئەوەنـدە روون و ئاشـکرایە پێویسـت بەبەڵگـە هێنانەوە ناکات.

لێرەوە گومڕایی و سەرلێشێواوی کۆمەڵی (التعطیل) [1] مان بۆ دەردەکەوێت کە مانای نـاوە پیرۆزەکانی خودایان (ﷻ )لە خودی ناوەکان دارنیوە و جیاکردۆتەوە وە دەڵێن: خـوای گـەورە (ﷻ ) بیسـەرە بە بێ ئالەتی بیستن ، بینەرە بەبێ بینینێ و ئالەتی بینین کە (چاوە)، وە بڵند و عەزیزە بە بێ مانا و سیفەتی (عزة ... هتد) هۆکاری ئەم راو بۆچونـەیان و بەڵگـەیان گوایە : جێگیرکردنی سیفات بـۆ پـەروەردگار (فـرە خوایـەتی) پیشـان دەدات چونکـە خـوای گـەورە و ناوەکانی هەر بوون و کۆنن جا ئەگەر بڵێین سیفاتەکانیش (قدیم) و کۆنـن لەگـەڵ بوونـی خـوادا ئەوا دوو (بوونی) جیاواز دەگەیەنن‌و فرە خوایی‌و شیرك دەردەچێت!!

بە راستی ئەمە شیکردنەوەیەکـی بێجێ و بێ بەڵگـەیە و دەقـەکـانی قـورئـان و عەقـڵ بـەرپـەرچی دەداتەوە .

بەڵگەی قورئان:

خوای مـهرەبان لەگـەڵ ئـەوەی تاکوتەنیایـە بەچـەندەها سیفەت و وەسـفیش باسـی خـۆی کردوە وەك لە سورەتی (البروج) ئایـەتی (١٢-١٥) دەفـەرموێت (إِن بَطْشَ رَبِّكَ لشديد إِنه هو يُبدِئُ ويُعيدُ وهو الغَفورُ الوَدودُ ذو العَرْش المجيد فَعَّال لِمَا يُريد) واتـە: بەراسـتی تۆڵـەی پەروەردگار زۆر توندو تیژەو، تەنها ئەوە سەرەتا هەموو شتێکی دروست کردوە دوای نەمانیشی دووبارە دروستی دەکاتەوە، هەر ئەو زاتەش زۆر لێخۆش بوو بەسۆزەو خـاوەنی تـەختی بڵند و

[1] - واتە پەکخستنی سیفاتەکانی خوا (ﷻ ) وەدارنینی لە ناوە پیرۆزەکـان ، ئەمانـە کۆمـەڵێکن لـە فەیلەسوفەکان و ئەوانەی بەدوور لە دەقە شەرعیەکان و بەڕاو ئەقلکاری باس لە سیفات و ناوە پیرۆزەکان دەکەن و قیاسی خالق دەکەنە سەر مەخلوقەکان.

پایەدارە. وە لە سورەتی (الاعلی) ئایەتی (١-٥) دەفەرموێت (سَبحِ اسَم ربِكَ الأعلىٰ الذي خَلَق فَسوّى والذي قدّر فَهدىٰ والذي أخرَج المَرعىٰ فَجعلَه غُثاء أحوىٰ) واتە: تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری بەرز و بڵندت بکە، ئەو زاتەی هەموو شتێکی دروستکردوە بەجوانی، ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێك و پاشان ڕێنموونی کردوە، ئەوەی کە گژ و گیای لە لەوەڕگا دەرهێناوە، بەڵام دوای ماوەیەك دەیکاتە پوش و پەڵاش زەردو و وشك و ڕەش هەڵگەڕاو..

جا لەم ئایەتەی سەرەوەدا کۆمەڵێك وەسف و سیفەتی جیاجیای خودا (ﷻ) باس دەکات و جێگیرکردنی ئەو وەسفانەش هیچ مانای (فرە خودایی) ناسەلمێنێ و کۆنی سیفاتەکان دژایەتی ناگەیەنێ لەگەڵ (بوون و کۆنی و ئەزەلی ) تاك و تەنهایی خوادا ، وەئایەتاکان (بوون و ناو و سیفاتەکان پێکەوە لەگەڵ زاتی پەروەردگاردا کۆ دەکاتەوە .

بەڵگەی عەقل:

لەبەرئەوەی(سیفات) جیاواز نی یە لەزاتی هیچ وەسفکراوێك وهەر زات و مەوجودێك کۆمەڵێك سیفەتی هەیە و لەگەڵ بوونی دا ئەو سیفاتانەش هەن کەواتە مادەم زاتی پیرۆزی الله (ﷻ) هەر بووە وکۆنە سیفەتەکانیشی هەبوون و کۆنن وجێگیرکردنیان (بونێك)ی جیاواز لە زاتی خودا پێك ناهێنێ.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ (الدهر) واتە زەمان ناوێك نی یە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار چونکە(الدهر) ناوێکە لە زمانی عەرەبی دا ڕیشەی نی یە وناگۆڕێت، هەروەها (الدهر) ناوە بۆ کات و زەمان، خوای میهرەبانیش دەربارەی ئەوانەی باوەڕیان نی یە بە زیندوو بونەوە دەفەرموێ (وقالوا ماهيَ إلاَّ حَياتُنا الدنيا نَموتُ ونَحيا وما يُهلِكُنا إلا الدَّهر) سورەتی (جاثية) ئایەتی(٢٤) مەبەستیشیان بە (الدهر) تێپەڕبوونی شەو و ڕۆژ بوو بەسەریاندا.

ئەم فەرمودەی پێغەمبەریشمان (ﷺ) کە لە خوای گەورە وە بۆمان دەگێڕێتەوە ﴿يؤذيني ابنُ آدمَ بسَبِّ الدهر،وأنا الدَهرُ بيدِيَّ الأمر أُقلِّبُ الليلَ و النهار﴾. واتە ئینسانەکان ئەزیەت و ئازارم دەدەن بەهۆی جوێن دانیان بە زەمان ، منیش خاوەنی زەمانم و گۆڕین و هەڵسوڕانی

شەو و ڕۆژ بە دەستی منە. ئەم فەرمودەیە بەڵگە و ئاماژەی بۆ ئـەوە تێدانییە کـە (زەمـان – الدهر–) ناوێك بێت لە ناوەکانی خودا (ﷻ) چونکە ئەوانەی جوێن دەدەن بـە (زەمـان و کـات) مەبەستیان ئەو کات و زەمانەیە کە ڕوداوەکانی تێدا ڕوودەدات ، نەك مەبەستیات خـوای گـەورە بێ ، هەر بۆیە مانای (الدهر) پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خۆی شەرحی کردووە (بيديّ الأمر أقلب الليـل و النهار). کەواتە خوای گەورە بەدیهێنەری کات و زەمانە و ئەوەش کە لە ناویاندا ڕوودەدات ، جا ناکرێ و ناگونجێ ئەو زاتەی کە کات و زەمانی دروست کردووە و بەدی هێناوە بۆ خۆشی کات و زەمان بێت ! !

کەواتـە:﴿المُقلِب بكسـر الـلام﴾ یـانی هەڵسـوڕێنەر نـاگونجێ ﴿المُقلَب بفتـح الـلام﴾ یـانی هەڵسوڕێنراو بێت لەهەمان کاتدا. لێرەوە بۆمان ڕوون بوویەوە کە نـاکرێ و نـابێت مەبەست لـە ناوی ( الدهر) خودا (ﷻ) بێت.

**بنەمای سێیەم:**

ناوەکانی خوای گەورە(ﷻ) ئەگەر ئاماژەی تێدابوو بۆ وەسفێکی تێپەڕیوو (متعـدی) ئـەوە سێ ماناو مەبەست لەخۆ دەگرێ

١–سەلماندنی ئەو ناوە بۆ خوای گەورە (ﷻ).

٢–سەلماندنی سیفەتێك بۆ خودا کە ناوەپیرۆزەکە ئاماژەی پێدەکات و لەخۆی دەگرێت .

٣–سەلماندنی حوکم و داواکاری ئەو ناوە پیرۆزە.

هەر بۆیە زانایانی شەرع زان دەڵێن (حەد) لەسەر چەتە و ڕێگـر (قطـاع الطريـق) لا دەچێت مادەم تەوبە دەکەن پێش دەسگیر کردنیان، بەڵگەیان ئایەتی (٣٤) لەسورەتی (المائدە) یە کـە دەفەرموێت (إلا الذين تابُوا مِن قَبـلِ إنَ تَقدِروُا عليهم فـاعلَموا أن الله غَفـوٌر رحيـم) واتـە (جگـە لەوانەی کەتۆبەیان کردووە، پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ، ئەوە بزانن کەبەڕاستی خـودا لێخۆشبوو میهرەبانە) بۆیە ئـەم دوونـاوە پـیرۆزەی خـودا (ﷻ) (الغفـور الرحيـم) لێخۆشـبوونی خوای میهرەبان بۆ گوناهەکانیان و بەزەیی وسۆزی خودا بەلابردنی (حەدی شەرعی) کە کوشتن

یا هەڵواسین یا دەست و قاچ برین یان نەفی کردنیان بۆ وولاتێکی تر پیشان دەدات مادەم تەویە بکەن پێش دەستگیر کردنیان.

نموونەیەکی تر: ناوی پیرۆزی (السمیع)ە کە هەر سێ مانا و مەبەستی پێشو لە خۆدەگرێت.

١–سەلماندنی ناوێك بۆ پەروەردگار کە (السمیع)ە.

٢–سەلماندنی سیفەتی (السمع) واتە بیستن بۆ پەروەردگار .

٣–سەلماندنی حوکم و مەبەست و حیکمەتی (بیستن) ئەوەیە کە خوای گەورە چۆن ئیش و کاری ئاشکرا دەبیستێت هەروەها پەنهانی و نهێنییەکانیش هەر دەبیستێ وەك لە سورەتی (المجادله) ئایەتی (١) دا دەفەرموێ ﴿والله یَسمعُ تَحاوُرَکما إن الله سمیع بصیر﴾. واتە: ئەی محمد (ﷺ) بێگومان خوا (ﷻ) بیستی و وەریگرت وت و وێژی ئەو ئافرەتەی کە گفت وگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، بەڕاستی خودا بیسەر و بینایە..

هەروەها ئەگەر ناوەکانی خودا (ﷻ) ئاماژە و وەسفێکی(غیر متعد) تێدا بوو ئەوا(٢) دوو مەبەست دەگەیەنێ

١–سەلماندنی ئەو ناوە بۆ خودا (ﷻ).

٢–سەلماندنی سیفەتێك بۆ خوای گەورە کە ناوە پیرۆزەکە لە خۆی دەگرێت.

وەك ناوی پیرۆزی (الحي) کەناوێك بۆ خودا دەسەلمێنێ وە هەم سیفەتێکیش دەگرێتە خۆ کە (الحیاة) واتە: ژیانی بەردەوام و بێ برانەوە بۆ زاتی خودا –عزو جل–

**بنەمای چوارەم:**

بەڵگە و ئاماژەی ناوەکانی خوای گەورە (ﷻ) لەسەر (بوون و سیفاتەکانی) خوا بەشێوەی بەرامبەر کردن (مطابقة) لە خۆگرتن و لێوەرگرتن دەبێت. بۆ نمونە: ناوی پیرۆزی (الخالق) واتە بەدیهێنەر، ئاماژە و بەڵگەیە بۆ زات و بوونی پەروەردگار، هەروەها ئاماژە و بەڵگەیشە بۆ سیفەتی(الخلق) واتە بەدیهێنان کاتێك خالق لەگەڵ سیفەتی(خلق) بەرامبەر دەکەین چونکە ناگونجێ خوای گەورە (خالق) بەدیهێنەر بێت و هیچی (خلق) نەکردبێ و سیفەتی(خەلق) نەبێت ..

دیسانەوە مادەم سیفەتی (الخالق) بەڵگەیە لەسەر (بوونی) خوا بە تەنها چونکە مادەم (خالقە) دەبێ (بوونی) هەبێت گەر وجودی نەبێت چۆن خالقە؟! هەروەها ئەم ناوە پیرۆزە بەتەنها بەڵگەیشە لە سەر سیفەتی (خلق) بە شێوەی مانای لەخۆگرتن (التضمن) چونکە ناگونجێ پەروەردگار ناوی (خالق) بێت و سیفەتی (خلق) ی نەبێت و هیچ بەدی نەهێنێت!!

هەروەها ئەم ناوە پیرۆزە (الخالق) بەڵگەیە لەسەر هەردوو سیفەتی (علیم و قودرەت) بەشێوەی (التزام) واتە لێوەرگرتن چونکە مادەم پەروەردگار (خالق) بێت کەواتە قودرەتی هەیە و بەقودرەتە بونەوەری خەلق کردوە ، هەروەها (خالق) ئاماژەیشە بۆ سیفەتی (علیم)، چونکە پەردەردگار کاتێ خالق بێت و بتوانێ بوونەوەر و ئەوەی کەتێیدایەتی خەلق بکات ، بێ گومان علیم و شارەزایی تەواویشی لەسەر هەمووی دەبێت .. هەر بۆیە کاتێ خوای بەدەسەڵات باسی دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی دەکات ئەفەرموێ: ﴿لِتعلَموا أنَ الله علىُ كُلِ شيءٍ قدير وأنَ اللهَ قد أحاطَ بكلِ شيءٍ علما﴾ سورەتی (الطلاق)، ئایەتی (١٢)، واتە: بۆ ئەوەی بزانن کە بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە بێ گومان خوا بەزانست و زانیاری خۆی گەمارۆی هەموو شتێکی داوە.

مەسەلەی لێوەرگرتن و پێویستی وەهابوون (لازم) هەر فەرموودەیەکی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوترابن لێوەرگرتن و پێویستی ئەو لێوەرگرتنە لازمە چونکە فەرمودەی خوا و پێغەمبەر حەقن وە (لازم الحق حق) بەڵام پێویستی (لزوم)ی قسەی غەیری خوا و پێغەمبەر (ﷺ) سێ حاڵەتی بۆ هەیە .

حاڵەتی یەکەم :

کەسێك ڕاو ووتەیەکی هەبێت و پابەندیش بێت پێیەوە، بۆ نمونە کەسێك کە نەفی سیفاتی (فعلی) دەکات لەخوای گەورە بڵێت بەو کەسەی کەسیفاتی فیعلی خودا دەسەلمێنێ.. مادەم سیفاتی فعلی خوا (ﷻ) دەسەلمێنی کەواتە ئەم قسەی تۆ (لازمە)و هەڵدەگرێ کەهەندێ کرداری خوای گەورە قەدیم نەبێت و پاش ناو سیفاتە قەدیمەکانی پەروەردگار ڕوویان دابێت و هاتبنە بوون.

ئەوەی کەسیفاتی فعلی دەسەلمێنێت لەوەڵامدا بڵێت: بەڵێ من پابەندم بە سەلماندنی ئەو سیفاتانە و خوای گەورە کۆن و ئێستاو داهاتوش (فَعّال لِما يُريد) واتە چی بووێت دەیکات و قسە و کردەوەکانی هەرگیز تەواو نابن وەك لە سورەتی (کهف) ئایەتی (١٠٩)دا دەفەرموێ ﴿قُلْ لو كانَ البحرُ مِداداً لِكلماتِ ربِّي لَنفِدَ البحرُ قَبل أنْ تنفدَ كَلماتُ ربّي وَلو جِئْنا بِمِثْلِه مَدَداً﴾ واتە: (پێیان بڵێ: ئەگەر دەریا هەمووی مرەکەب بێت زانست و زانیاری پەروەردگارمی پێبنوسرایە، دەریا هەمووی تەواو دەبوو پێش ئەوەی زانست و زانیاری پەروەردگارم تەواو ببێت ئەگەر چەندەها ئەوەندەی‌تر دەریا بهێنن‌و بیکەنە مرەکەب، چونکە زانست‌و زانیاری پەروەردگار کۆتایی نایەو بێسنورە.. هەروەها لەسورەتی (لقمان) ئایەتی (٢٧)دا دەفەرموێ: ﴿ولو أنما في الأرضِ مِن شجرةٍ أقلام و البحرُ يَمدُّه من بَعدِهِ سَبعةُ أبْحُرٍ ما نَفِدَتْ كلماتُ الله إنَّ اللهَ عزيزٌ حكيم﴾. واتە: (خۆ ئەگەر بەڕاستی هەرچی درەخت هەیە لە زەویدا ببنە پێنوس، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندەو ببێتە مرەکەب‌و زانست و نهێنی دروست کراوەکانی خوا (ﷻ) بنوسێتەوە، ئەوە هێشتا زانست و زانیاری و فەرمانەکانی خوا هەر تەواو نابێ، بەڕاستی خوای گەورە بەدەسەڵاتەو دانایە). جا ڕودانی کرداری نوێ لەلایەن پەروەردگارەوە نابێتە کەم و کورتی لەحەقی خودا. هیچ لازم نی‌یە کەمادەم خوای گەورە (ناوو سیفاتەکانی) قەدیمن و هەر بوون، کردارەکانیشی هەر قەدیم بن!

حاڵەتی دووەم:

کەسێك ڕاو ووتەیەکی هەبێت بەڵام ڕاو ووتەکەی لازم نیە کەشتی تری لێوەر بگیرێت وەقیاس بکرێتەسەر پەروەردگار بۆ نموونە: ئەو کەسەی نەفی سیفات دەکات بڵێ بەو کەسەی کە سیفات دەسەلمێنێ: مادەم تۆ سیفات دەسەلمێنی بۆ پەروەردگار کەواتە خوا (ﷻ) هاوشێوەی دروست کراوەکانێتی لەسیفاتەکانیدا..

سەلمێنەری سیفات لەوەڵامدا دەڵێ: لازم و پێویست نی‌یە بەو شێوەیە بێت، چونکە سیفاتەکانی خودا ئیزافە دەکرێ بۆلای خۆی و هیچ کات بەتەنها و بەگشتی باس نەکراون هەتا تۆ گومانی وەها بەریت! بۆیە ئەو سیفاتانە تایبەتن بە زاتی خواوە (ﷻ) و تەنها لایەقی ئەون. بەڵگەیەکی تری بەهێزی سەلمێنەری سیفات ئەوەیە کە بەرپەرچی تاقمی (المُشَبِهة) واتە:

ئەوانەی خوای گەورە هاوشێوە دەکەن بە مەخلوقات، دەدەنەوە دەڵێن بەوانەی نەفی سیفات دەکەن چۆن ئێوە نەفی سیفات دەکەن، چۆن بوونی خوا دەسەلمێنن و هەروەها ئەوەش دەسەلمێنن کە پەروەردگار لە زاتی خۆی دا هاوشێوەی مەخلوقات نی‌یە، دەی کەمادەم لە زاتی دا هاوشێوەی مەخلوقات نی‌یە ئەی بۆ لە سیفاتەکانیدا هاوشێوە بێت؟! جیاوازی لەنێوان زات و سیفات دا چی‌یە؟!.

حاڵەتی سێیەم:

ئینسانەکان لەبەرئەوەی کە ئینسانن و حاڵەتی نەفسی و خارجی کاریان تێدەکات، جار هەیە ئینسان شتی لە یاد دەچێت یا بێ ئاگا دەبێت یا فکری جام دەبێت و تورەیی دەیگرێت ولە خۆوە بریارێك دەدات، بۆیە ناکرێ بریار بدەین کە(لازم القول قول) لە حەقی ئینساندا بۆیە گەر ئینسانەکان هەر بریار و قسەیەك بکەن نابێ دەرهاوێشتە و (لوازمی) ئەو بریار و قسەیە چی دەگەیەنێ لێ ی وەربگیرێ مادەم خاوەنەکەی خۆی هیچی لەسەر نەوتبێ چونکە (لا ینسب الى القائل قول) واتە: نابێ نیسبەتی هیچ قسەیەك بدرێتە پاڵ کەسێك کە نەیوتبێت.

## بنەمای پێنجەم:

ناوەکانی خوای گەورە –توقیفیة– واتە ئەوەندەی کە لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا هاتووەو مۆڵەت نادرێ بە عەقڵ کەقسەی تێدا بکات. لەسەر ئەم بنەمایە مۆڵەت نادرێ بە عەقڵی مرۆڤەکان زیاد لە دەقەکانی قورئان و سوننەت ناوە پیرۆزەکانی خودا (ﷻ) زیادو کەم بکەن.

هەر وەك لەسورەتی (ئیسراء) ئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ ﴿ولا تَقْفُ ما ليس لكَ به عِلم إنَ السمعَ و البصَر والفؤادَ كلّ أولئِكَ كان عَنه مَسؤولاً﴾. واتە: ئەی ئینسان لە شتێك مەدوێ و شوێنی مەکەوە کەزانست و زانیاریت دەربارەی نی‌یە، چونکە بە ڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەر پرسیارە لەبەرامبەریەوە هەروەها لەسورەتی (الأعراف) ئایەتی (٣٣)دا دەفەرموێ ﴿قل إنما حرّم ربيَ الفواحشَ ما ظَهر منها وما بَطَن و الإثمَ و البَغيَ بغيرِ الحَق وأن تُشرِكوا باللهِ ما لم يُنزل به سُلطاناً وأن تَقولوا على اللهِ مالا تَعلمون﴾. واتە: ئەی

پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم هەرچی گوناه و خراپە یە حەرامی كردووە چ ئەوانەی ئاشكران، چ ئەوانەی پەنهانن، هەروەها هەموو گوناه و داخوازی و دەست درێژی‌یەكی بەناحەقی حەرام كردووە، شتێك بكەن بە شەریك و هاوەڵ بۆ خودا كە هیچ دەسەڵاتی پێنەدراوە هەروەها حەرامی كردووە لە خۆتانەوە بە ناوی خواوە دوور لە زانیاری شت بڵێن.

بۆیە هەر (ناوێك) بۆ پەروەردگار دابنرێت كە خۆی بۆ خۆی دیاری نەكردبێت، یا ئینكاری لە (ناوێك) بكرێت كە بۆ خۆی دیاری كردووە ئەوە تاوان و جینایە تێكە لە حەقی پەروەردگاردا دەكرێت و پێویستە ئینسانەكان سنوری ئەدەب نەبەزێنن و پابەندبن بەو ناوە پیرۆزانەوە كە لە دەقەكانی قورئان و سوننەتدا هاتوون.

## بنەمای شەشەم:

ناوە جوانەكانی خودا (ﷻ) لە ژمارەیەكی تایبەتدا كورت هەڵنەهاتوون.

بەڵگەمان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ) كە دەفەرمووێ ﴿أسألك بكل اسمٍ هو لك سمَّيتَ به نفسَك أو أنزلتَه في كتابِك، أو علَّمتَه أحداً من خلقِك أو استأثرتَ به في علم الغيبِ عندَك﴾. رواه أحمد وابن حبان والحاكم وهو صحيح. واتە: پەروەردگارا داوات لێدەكەم ، بە هەموو ئەو ناوە جوانانەی كە بۆ خۆتت داناوە، یا لە قورئاندا باست كردووە. یا لە (علم الغیب)دا لای خۆت هێشتووتنەوە و بە كەست نەوتوون.

جا ئەو ناوە پیرۆزانەی كە خوا (ﷻ) لای خۆی هێشتونیەتەوە لە (علم الغیب)دا، دیارە بۆ هیچ كەس نی‌یە بیانزانێت.بەڵام ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ، دەفەرموێ ﴿إن لله تسعةً و تسعينَ اسماً مائة الا واحداً مَن أحصاها دخلَ الجنة﴾. واتە: بۆ خوای گەورە هەیە (٩٩) ناو هەر كەس بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشت. ئەم فەرموودەیە بەڵگە نی‌یە لەسەر دیاری كردنی تەنها (٩٩) ناو بۆ خوای گەورە چونكە گەر مەبەست (حصر) واتە كورت هەڵهێنان لەسەر ئەو ژمارەیە بوایە دەبوو بەم شێوەیە بیفەرمووایە ﴿إن اسماءَ الله تسعةٌ و تسعون اسماً من أحصاها دخل الجنة﴾. واتە: ناوەكانی خوا تەنها (٩٩) ناون و هەر كەس بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشت .

کەواتە مانای ڕاستی فەرموودەکە ئەمەیە: ئـەم کۆمەڵـە نـاوە پـیرۆزەی کـە(٩٩) نـاون هـەر کەس بە ئیمان پـێ بـوون وەك زیکـر بیـانخوێنێت دەچێتـە بەهەشـتەوە بۆیـە برگـەی دووەمـی فەرموودەکە (من أحصاها دخل الجنة) جوملەیەکی تەواوکەری پێش خۆیـەتی نـەك جوملەیـەکی سەربەخۆ، نمونەی ئەمەش وەك ئەمەیە کە بڵێ ی من (١٠٠) دینارم داناوە بۆ خـێر، ئەمـە ئـەوە ناگەیەنێ تۆ تەنها ئەو (١٠٠) دینارەت هەبێت و پارەی ترت نەبێ و دات نەنابێ بۆ خێر..

وە هیـچ فەرموودەیـەکی (صحیح) لـــەبارەی دیـار کردنـی (تعیـین) نـاوە پیرۆزەکانـــەوە نەهاتووە، ئەو فەرمودەیـەش کەلـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) هـاتووە بـە(تعیین) دیـاری کـردن فەرمودەیەکی (ضعیف)ە.

شێخی ئیسلامیش (ابن تیمیه) لەکتێبی الفتاوی ج٦ لاپەڕە(٣٨٢) دا دەڵێـت: دیـاری کردنـی (تعیین) ناوە پیرۆزەکان لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) نی‌یە بەبڕیاری هـەموو زانایـانی شـارەزا لەفـەرموودەکان. وە لەهـەمان کتێبـدا شێخولئیسـلام لەلاپـــەڕەی (٣٧٩) دەڵێـت: وەلیـد کـە (گێڕەرەوەی فەرموودەکەیە) لەهەندێك لە شێخەکانی خۆی کەخـەڵکی (شـام)ن وەری گرتـوە و وەتوێژەرێك (مفسر) لەچەند ڕێگایەکی وەرگرتنی ئەم فەرموودەیەوە دەری هێناوە.

هەروەها ئیبنولحەجـەریش لـەکتێبی نـاوداری (فتـح البـاری)دا لـە ج١١ چاپخانـەی (السـلفیه) لاپـەڕە (٢١٥) دەڵێـت (لیست العِلة عند الشیخین (البخاري و مسلم) تَفَرُّدِ الولید فقـط، بـل الاختلاف فیه والاضطراب و تدلیسهِ و اِحتمالِ الادراج)، واتـە خەلـەل و لاوازی لـە سـەنەدی ئـەم فەرمودەیەدا تەنها ئـەوە نی‌یە (ولیـد) بەتەنـها گێڕاویەتیـەوە، بـەڵکو سـەرەڕای ئـەو بـە تەنـها گێڕانـەوەش، جیـاوازی و تێـك چـوون و ناوهێنـانی کەسـانێك کەهـەر لەسـەنەدی گێڕانـەوەی فەرموودەکەدا نین و نابێ بێن و تێکەڵ کراون بەسەنەدی تر..

جامادەم دیاری کردنی (تعیین) (٩٩) ناو لای زانایـان نەسـەلمێنراو (صحیح)یش نـەبوو لـە پێغەمبەری خواوە کەمەبەست تەنها ئەم (٩٩) ناوە بێت، هـەر بۆیـە دەبینـین زانایـانی سـەلەف جیاوازی ڕاو بۆچونیان لە بارەیەوە هەیە، بۆیە منیش پاش ووردبونـەوە لـە قورئـان و سـونەت ئەم (٩٩) ناوەپیرۆزەم دەرهێنا.

لە قورئاندا ئەم ناوە پیرۆز و جوانانە..

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| الله | الأحد | الأعلى | الأكرم | الإله | الأول |
| الآخر | الظاهر | الباطن | الباري | البر | البصير |
| التواب | الجبار | الحافظ | الحسيب | الحفيظ | الحفي |
| الحق | المبين | الحكيم | الحليم | الحميد | الحي |
| القيوم | الخبير | الخالق | الخلاق | الرؤوف | الرحمن |
| الرحيم | الرزاق | الرقيب | السلام | السميع | الشاكر |
| الشكور | الشهيد | الصمد | العالم | العزيز | العظيم |
| العفو | العليم | العلى | الغفار | الغفور | الغنى |
| القوي | القهار | الكبير | الكريم | الطيف | المؤمن |
| المتعالى | المتكبر | المتين | المجيب | المجيد | المحيط |
| المصور | المقتدر | المقيت | الملك | المليك | المولى |
| المهيمن | النصير | الواحد | الوارث | الواسع | الودود |
| الوكيل | الولي | الوهاب | | | |

وە لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) .

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| الجميل | الجواد | الحكم | الحيّ | الربّ | الرفيق |
| السبوح | السيد | الشافي | الطيب | القابض | الباسط |
| المقدم | المؤخر | المحسن | المعطي | المنان | الوتر |

ئەمانـە كـۆی نـاوە جوانـەكان بـوون كـەدەرمان هێنـابوون (٨١) نـاو لـەقورئاندا و(١٨) نـاو لەفەرمودەكانی پێغەمبەردا (ﷺ).

هـەر چـەندە بـەگومان ودودڵـم لەڕیزیـەندكردنی نـاوی (الحفي) چونكـە بەتەنهاو بـێ ئیضافـە دەربارەی پێغەمبەر ئیبراهیم –سەلامی خوای لێ بێت– هاتووە لەسورەتی (مريم) ئایـەتی (٤٧) دا دەفەرموێ ﴿إنه كان بي حَفيا﴾ واتە ئیـبراهیم دەفـەرموێ: بەڕاسـتی پـەروەردگار منـی زۆر خۆش دەوێت و ڕێزی بۆ داناوم..

هەروەها ناوی (المحسن) یش شێخو ئیسلام لە ڕیزی ناوە پیرۆزەكاندا باسی كردووە بـەلاّم! لە(سنن الطبراني) دا گەڕام (لم نَطلّع على رُواته) واتە گێڕەرەوەكانی فەرمودەكەم نەدۆزیەوە!

دیارە هـەندێكیش لـەناوە جوانـەكانی پـەروەردگار بەشێوەی ئیضافـە هـاتوون وەك (مـالك الملك، ذي الجلال و الأكرام)

**بنەمای حەوتەم:**

تەحریف كردنی ناوە جوانەكانی پەروەردگار و دەركردنیان لەماناو مەبەستی ڕاستی خۆیـان . ئەمەش بە یەكێك لەم شێوانەی خوارەوە دەكرێت:–

یەكەم:

نەسەلماندنی ناوێك لە ناوە پیرۆزەكان و ئەو مانا و مەبەستەی كـﻪ لـە خـۆی دەگرێت وەك ئاماژەكردن بۆسیفەتێك لە سیفەتەكانی خوای پەروەردگار وە حوكمێك لە حوكمە جوانەكانی .. وەك چۆن گرۆی (التعطيل من الجهمية) [٢] دا دەڵێن..

ئەمەش دەبێتە تەحریف كردن و لادانی ناوێك لەناوە جوانەكانی.. چونكـە واجبـە باوەڕمـان بێ بە ناوە جوانەكان و ئەو حوكم و سیفاتانەی پەروەردگاریش كەلـە ناوەكـانیدا دەردەكـەون و نەسەلماندن و ئینكاری هەر شتێك لەمانە ئینحراف ولادانە لەوەی كە واجبە لەسەرمان.

---

[٢]– (الجهميه) تاقمێك بوون بەڕێبەرایەتی (جهمی كوڕی صفوان) كەلە زەمانی تابعیندا تیاچوەو دەڵێن ، تەنها زاتی خوا (ﷻ) مخلوق نی یە و قەدیمە بـەلاّم نـاوو سیفاتەكانی پاشـتر پـەیدا بـوون وەك مـەخلوقاتی تـر ! بۆیـە دەڵێن: نـاوو سیفاتەكانی پەروەردگار نابێ كاریگەریان هەبێت و خوا سیفەتی (كلام و سمع)ی نی‌یە ! !

دووەم :

جۆری دووەمی تەحریف و لادان لـەمانای راستی ناوەكـان ئەمەیە كـە بگوترێت: ناوەكـان ئاماژەیان تێدایە بۆ چەند سیفاتێك، بـەڵام سیفاتەكان (تشـابە) چوێنرابن بەسیفاتی مـەخلوق وەك كرۆ و تاقمی (أهـل التشـبیە) دەڵێـن! !. دیـارە تەشـبیهی (چوانـدن)ی سیفاتی خـالق بـە سیفاتی مەخلوق قسەیەكی بەتاڵ و تاوانێكی گەورەیە وە هەرگیز دەقەكانی قورئان و سوننەت شتی وەها نافەرموون.

سێ یەم:

ناوێك بۆ پەروەردگار دابنرێت كە خوای گەورە بۆ خۆی دانەنابێت هەر وەك چۆن گاورەكـان (النصاری) ناوی (الاب) واتە (باوك) یان داناوە بۆ خودا (ﷻ)، وەفەیلەسوفەكان (العلە الفاعلە) واتـە ( هـۆی كاریگـەری یەكـەم).. جـا هـەروەك پێشـتر ئاماژەمـان پێكـرد نـاوە جوانـەكانی پەروەردگار (توقیفیة) واتە تەنها بۆ خـوای گـەورە و پێغەمبـەر (ﷺ) هەیـە دیـاری بكـەن و هـەر دیاری كردنێكی تر لادانە لە ئەركی سەرشانمان بەرامبـەر بـە نـاوە پیرۆزەكـان و زیـادە ڕەوییـە تێیاندا وە خوا (ﷻ) لەوە پاك و بێگەرد ترە ئەو ناوانەی لیٚ بنرێت.

چوارەم:

لە ناوەكانی خوای گەورە چەند ناوێك دەربهێنرێت و ناوی بتەكانی لیٚ بنرێت ، هەروەك چۆن موشریكەكانی ئەوسا ناوی بتێكیان نابوو (العُزّیٰ) كەلە ناوی پیرۆزی (العزیـز) وەریـان گرتبـوو! هەروەها ناوی بتێكی تریان نابوو (اللات) گوایـە لـە نـاوی پـیرۆزی (الالـە) دەریـان هێنـابوو جـا لەبەرئەوەی ناوە پیرۆزەكانی خوا (ﷻ) تایبەت و وابەستەن تەنها بەخۆیـەوە ، نـابێ و نـاكری هیچ كەسێكی تر ئەو ناوانە بەكاربـهێنێت ... هـەروەك لـە سـورەتی (الاعـراف) ئایـەتی (١٨٠)دا هاتووە دەفەرمویٚ ﴿ولله الاسماءُ الحُسنیٰ فادعوه بها﴾ ، واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جـوان و پیرۆزەكان جا ئەی ئیمانداران بەو ناوانە دوعا و نزا بكەن..

وە لە سـورەتی (طە) ئایـەتی (٨)دا دەفـەرمویٚ ﴿الله لا إلـه إلا هـو لـه الأسمـاءُ الحُسـنی﴾ واتـە: الله زاتێكـە جگـە لــەو خوایـەكیتر نیـیە هــەرچی نـاوە پـیرۆز و جوانـەكان هەیــە هــەر شایستەی ئەوە..

دووەم :

جۆری دووەمی تەحریف و لادان لـەمانای راستی ناوەكـان ئەمەیە كـە بگوترێـت: ناوەكـان ئامازەیان تێدایە بۆ چەند سیفاتێك، بـەڵام سیفاتەكان (تشـابە) چوێـنرابن بەسـیفاتی مـەخلوق وەك گرۆ و تاقمی (أهـل التشـبیە) دەڵێـن!!. دیـارە تەشـبیهی (چوانـدن)ی سـیفاتی خـالق بـە سیفاتی مەخلوق قسەیەكی بەتاڵ و تاوانێكی گەورەیە وە هەرگیز دەقەكانی قورئان و سوننەت شتی وەها نافەرموون.

سێ یەم:

ناوێك بۆ پەروەردگار دابنرێت كە خوای گەورە بۆ خۆی دانەنابێت هەر وەك چۆن گاورەكـان (النصاری) ناوی (الاب) واتە (باوك) یان داناوە بۆ خودا (ﷻ)، وەفەیلەسوفەكان (العلە الفاعلە) واتـە ( هۆی كاریگـەری یەكـەم).. جـا هـەروەك پێشـتر ئامازەمـان پێكـرد نـاوە جوانـەكانی پەروەردگار (توقیفیة) واتە تەنها بۆ خـوای گـەورە و پێغەمبـەر (ﷺ) هەیـە دیـاری بكـەن و هـەر دیاری كردنێكی تر لادانە لە ئەركی سەرشانمان بەرامبـەر بـە نـاوە پیرۆزەكـان و زیـادە ڕەوییـە تێیاندا وە خوا (ﷻ ) لەوە پاك و بێگەرد ترە ئەو ناوانەی لیٚ بنرێت.

چوارەم:

لە ناوەكانی خوای گەورە چەند ناوێك دەربهێنرێت و ناوی بتەكانی لیٚ بنرێت ، هەروەك چۆن موشریكەكانی ئەوسا ناوی بتێكیان نابوو (العُزّیٰ) كەلە ناوی پیرۆزی (العزیـز) وەریـان گرتبـوو! هەروەها ناوی بتێكی تریان نابوو (اللات) گوایـە لـە نـاوی پـیرۆزی (الالـە) دەریـان هێنـابوو جـا لەبەرئەوەی ناوە پیرۆزەكانی خوا (ﷻ ) تایبەت و وابەستەن تەنها بەخۆیـەوە ، نـابێ و نـاكری هیچ كەسێكی تر ئەو ناوانە بەكاربـهێنێت ... هـەروەك لـە سـورەتی (الاعـراف) ئایـەتی (١٨٠)دا هاتووە دەفەرمویٚ ﴿ولله الاسماءُ الحُسنیٰ فادعوه بها﴾ ، واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جـوان و پیرۆزەكان جا ئەی ئیمانداران بەو ناوانە دوعا و نزا بكەن..

وە لە سـورەتی (طە) ئایـەتی (٨)دا دەفـەرمویٚ ﴿الله لا إلـە إلا هـو لـە الأسماءُ الحُسـنی﴾ واتـە: الله زاتێكـە جگـە لــەو خوایـەكیتر نییـە هــەرچی نـاوە پـیرۆز و جوانـەكان هەیــە هــەر شایستەی ئەوە..

وە لە سورەتی (الحشـر) ئايـەتی (٢٤)دا دەفـەرموێ ﴿لـە الاسمـاء الحسـنی يسبح لـە مـا فی السماوات والارض﴾ واتـە : نـاوە پـيرۆز و جوانـەكان هـەمووی شـايستەی ئـەون ، هـەرچی لەئاسمانەكان و زەويدا هەيە ستايشی ئەو دەكەن ، بەڕاستی ئەو زاتە خوايەكی بالآدەست و دانايە.

هەربۆيە تـەحريف و لادانـی مانـای نـاوە جوانـەكانی پـەروەردگار بەهـەموو جۆرەكانيـەوە حەرامـە و خـوای بالآدەست هەڕەشـە لـە (ملحدين) دەكـات واتـە ئەوانـەی تـەحريفی نـاو و سيفاتەكان دەكەن و بەكاريان دێنن بـۆ غـەيری خـوا وە لـە سـورەتی (الاعراف) ئايـەتی (١٨٠) دەفەرموێ ﴿وذَرُوا الذينَ يُلحِدون في أسمائه ، سيُجزَون ماكانوا يعملون﴾ واتە: وازبهێنن لەوانـەی كەلە ناوە پيرۆزەكانی خوادا لادان دەكەن و بۆ غەيری خوا بەكاريان دێنن و لەئايندەدا پاداشتی ئەو كارو كردەوانەيان وەردەگرن..

جابەپێی سياق و داخوازی بەڵگە شەرعيەكان هەندێ لەو لادان و (إلحادە) دەبێتە هاوەڵ بۆ خودا بڕياردان و هەندێ جاريش دەبێتە (كوفر)، خوای گەورە بمانپارێزێت...

## چەند بنەمايەك سەبارەت بە سيفاتەكانی خوای گەورە

**بنەمای يەكەم :**

سيفاتەكانی پەروەردگار هەموويان سيفاتی كەماڵن بۆ خودا (ﷻ) بە هيچ شێوەيەك مانای كەم و كوڕی هەڵناگرێ.

وەك سيفاتەكانی (الحياة / ژيان ، العلم / زانين ، القدرة / دەسـەڵات ، السمع / بيسـتن ، البصر / بينين، الرحمة / بەزەيی ، العزة / سەر بڵندی ، الحكمة / دانايی ، العلـو / بـەرزی و پايـەداری ، العظمـة / شـكۆمەندی...... هتـد). بەڵگـەشمان لەسـەر ئـەم سيفاتانە بەڵگـەكانی قورئان و سونەت و عەقڵ و فيترەتی پاكە.

بەڵگەی قورئان:

سورەتی (النحل) ئایەتی (٦٠) دەفەرموێ ﴿ للذين لا يؤمنون بالآخرة مَثلُ السَّوء ولله المَثَلُ الأعلىٰ في السموات و الأرض وهو العزيز الحكيم﴾ واتە : سیفەت و ناو نیشانی ناشرین و نزم و خراپ شایستەی ئەوانەیە كەباوەڕ بە قیامەت ناكەن ، خوای پەروەردگاریش خاوەنی هەموو سیفاتی بەرزو بڵندو پیرۆزەو ئەو زاتە هەر خۆیشی بالآدەست و دانایە(والمثل الأعلى) كەلە ئایەتەكەدا هاتووە واتە ( الوصف الأعلى) یانی بەرزترین وەصف و شایستەیی هەر بۆ خوایە.

بەڵگەی عەقل:

ئەمەیە كە هەموو دروستكراوێك بوونێكی واقعی و ڕاستی هەیە و دیارە مادەم (بوونی) هەیە سیفاتیشی هەیە ، جا سیفاتی كامڵ بن یاسیفاتی ناتەواو ، گومانیش نی یەكەخوایەكی بالآدەست و شیاو بۆ پەرستن ناگونجێ خاوەنی سیفاتی ناتەواو بێت! هەربۆیەش خوای بڵند و خاوەن دەسەڵات هیچ و پووچێتی خوایەتی بتەكانی دەرخستوە بەوەی كەسیفاتی نەقس و دەستەو سانی لەخۆدەگرن.

ئەوەتا خوای گەورە لەسورەتی (الأحقاف) ئایەتی (٥)دا دەفەرموێ ﴿ومَن أضلُّ مِمَّن يدعو مِنْ دُونِ الله مَن لا يَستجيبُ له الىٰ يومِ القيامة وَهُم عن دُعائهم غافلون﴾ واتە : جائیتر كێ لەو كەسە گومراترە كە دۆعا و نزا ، ڕوو بەكەسێك یا شتێك دەكات جگە لەخوا كە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێنەوە هەر بێ سوودە ، لەكاتێكدا ئەوانە لە دۆعا و پاڕانەوەی ئەوان بێ ئاگاو غافڵن و هەستی پێ ناكەن.

هەروەها لە سورەتی (النحل) ئایەتی (٢٠ ، ٢١)دا دەفەرموێ ﴿ و الذين يدعون من دون الله لايَخلقون شيئاً وهم يُخلَقون أمواتٌ غيرُ أحياءٍ وما يَشعرون أيّانَ يُبعثون ﴾ واتە : ئەو بت و كەس و شتانەی كە هاواریان لێ دەكەن و دەیانپەرستن جگەلە خوا ، هیچیان پێ دروست ناكرێت لەكاتێكدا كە خۆیان دروست كراون ، ئەوانە مردوون و زیندو نین ، هەستیش ناكەن كەی خۆیان و خەڵكی زیندوو دەكرێنەوە. هەروەها لەسەر زمانی ئیبراهیمەوە –سەلامی خوای لەسەر بێت– دەگێڕێتەوە كاتێ ڕەخنە و گازندە لەباوكی دەگرێت و دەڵێت ﴿يا أبتِ لِمَ تعبُد مالا يَسمَعُ ولايُبصِر ولايُغني عنكَ شيئاً﴾ سورەتی (مريم) ئایەتی(٤٢) ، واتە : كاتێك بەباوكی گوت : باوكی

بەڕێزم : ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستیت کەنەدەبیستێ، نەدەبینێ، نەهیچ سوودێکت پێ دەگەیەنێ .

هەروەها بەبەڵگەی بینین و هەست پێ کردن ڕوون بۆتەوە کە مەخلوقات هەندێ صیفاتی کەماڵیان هەیە ، دیارە سیفاتی کەماڵیش دەبێ یەکێك هەبێ بیبەخشێ ، کەواتە بەخشەری سیفاتی کەماڵ تەنها خوای گەورەیە و ناگونجێ لە مەخلوقاتەکانیدا سیفاتی کەماڵ هەبێت و لەخۆیدا نەبێت ! !

بەڵگەی (فطرة) سروشت:

لەبەر ئەوەی دەروونی پاك پێش ئەوەی تێکەڵی گوناه و کۆمەڵگای جاهلی ببێت ڕاهاتوەو دروست کراوە لەسەر خۆشەویستی خواو بە گەورە دانانی و پەرستنی ، جا ئایا ئەگونجێ خوایەك خۆش بویسترێ و بەگەورە سەیر بکرێ و بپەرسترێ ئەگەر خاوەنی سیفاتی کەماڵ نەبێت؟!

جا هەر سیفەتێك کەم و کوڕی لێ بفامرێتەوە ناکرێ بدرێتە پاڵ پەروەردگار وەك سیفاتەکانی (مردن ، نەزانین ، لەبیرچوون ، دەستەوەستانی ، کوێری و کەڕی و ......... هتد) چونکە خوای بالادەست لەسورەتی (الفرقان) ئایەتی (٥٨) دەفەرموێ ﴿وتوكَّل على الحَي الذي لايمُوت﴾ واتە : تۆ ئەی محمد (ﷺ) پشت ببەستە بەو زاتەی کەهەمیشە زیندوە و هەرگیز نامرێت. هەروەها لەسورەتی (طه) ئایەتی (٥٢) لەسەر زمانی موسی -سەلامی خوای لێ بێت- دەفەرموێ ﴿في كتابٍ لا يَضِل ربي ولا يَنسىٰ﴾ واتە: موسا فەرموی زانیاری ئەوانە لای پەروەردگارمە ولە دۆسیەکانی (لوح المحفوظ)دا پارێزراوە، پەروەردگاری من هیچی لێ وون نابێت، هیچ شتێکیش فەرامۆش ناکات.

دیسانەوە لە سورەتی (الزخرف) ئایەتی (٨٠)دا دەفەرموێ ﴿أم يَحسَبون أنا لا نَسمَعُ سِرَّهم ونَجواهُم بلىٰ ورُسلنا لدَيهم يكتُبون﴾ واتە : ئایا ئەوانە وا دەزانن کەئێمە لەنهێنی و چپەیان بێئاگاین و نابیستین؟! نەخێر وانی یە ئێمە زۆر ئاگادارین و فریشتەکانیشمان وردو درشتی گوفتارو کرداریان تۆمار دەکەن.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی دەجالەوە دەفەرموێ ﴿إنه أعور ؟ و إن ربكم ليس بأعور﴾. واتە: دەجال چاوێکی کوێرە و نابینێ بەڵام خوای گەورە چاوی ساغە و دەبینێت. وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ ﴿أيها الناسُ أَربِعُوا على أنفسِكم فإنكُم لا تَدعون أصَمَّ ولا غائباً﴾. واتە: ئەی خەڵکینە هێواش و لەسەرخۆبن لەکاتی دوعا کردندا چونکە ئێوە ناپاڕێنەوە لە کەسێك کەڕ بێت یا نادیار و ئامادە نەبێت..

ئەوەتا خوای پەروەردگار تۆڵە و سزای لەسەر ئەو کەسانە داناوە کە وەصفی پەروەردگار دەکەن بەشێوەی نالایەقی و کەمی وەك لە سورەتی (المائدە) ئایەتی (٦٤)دا دەفەرموێ ﴿وقالت اليهود يدُ الله مَغلولة غُلَّت أيديهم ولُعِنوا بما قالوا بل يَداه مبسوطَتان يُنفق كيف يشاء﴾. واتە: ( جوولەکەکان دەڵێن خوا دەستی بەستراوە و خێری لە دەست نابێتەوە، دەك دەستیان بەستراوو بێ خێر و کەلەبچە و تووشی شەلەل بێت ، دەك نەفرینیان لێ بێت بۆ خۆیان و قسەیان، نەخێر وانییە بەڵکو دوو دەستەی پەروەردگار هەمیشە و بەردەوام کراوەیە و چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت). هەروەها لەسورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٨١)دا دەفەرموێ ﴿لقد سمِعَ الله قولَ الذين قالوا إن الله فقيرٌ ونحنُ أغنياء سَنكتُب ماقالوا وقَتلِهمُ الأنبياء بغيرِ حق ونَقولُ ذوقوا عذاب الحريق﴾ واتە : بێگومان خوای گەورە گوفتاری (نابەجێ ی) ئەو جولەکانەی بیست کە وتیان : خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین!! ئێمە ئەو گوفتارانە تۆمار دەکەین لەسەریان هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بەدەستی ئەوان بەناحەق ، لەدۆزەخیشدا پێیان دەڵێین : بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر خوای گەورەش بۆ خۆی هەر سیفاتێکی نەقس و کەمی ڕەد دەکاتەوە. لە سورەتی (الصافات) ئایەتەکانی (١٨٠ ، ١٨١ و ١٨٢)دا دەفەرموێ ﴿سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين﴾ واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارت ، پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات ، لەوەی کە ئەوان دەیدەنە پاڵ ئەو زاتە بێ هاوەڵ و هاوتایە. وەلە سورەتی (المؤمنون) ئایەتی(٩١)دا دەفەرموێ ﴿ما اتخذ الله من ولد وما كان معه مِن إلهٍ إذاً لذهَب كلُّ إلهٍ بما خَلق ولعلاَ بَعضُهم على بعض ، سبُحانَ الله عما يَصفون﴾ واتە: هەرگیز خوا (ﷻ) کەسی نەکردوە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نی یە ، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوانی

خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا ، پـاکی و بێگـە دی بۆ زاتـی خوای لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خوانەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن .

جا هەر سیفەتێکی پەروەردگار کەسیفەتی (کەمالّ) بێت لەحاڵەتێکداو لە حاڵەتێکی تریشـدا ماناى سیفەتی نەقس و کەمی ببەخشێت ئەوە لەحەقی خـودا (ﷻ) نـاگونجیّ.. بۆیـە دەبینـین خوای گەورە هەندێ سیفات بەتەنها بەکار ناهێنیّ وەك سیفاتی (المكر، الكيـد، الخـداع) چونکـە سیفاتی نەقس و کەمی پیشان دەدەن ، بەڵکو لە حاڵەتێکدا پەروەردگار بەکاریان دەهێنێت کـە رەد و وەڵام بن بۆ کافران و ملـهوڕان بـەوەی خـودا (ﷻ) زەلیـل و ڕیسـوایان دەکـات و فێڵ و دەسەلأتیان بەرامبەر پەروەدگار هیچ نی یە و بۆشە هەروەك لە سورەتی (الأنفال) ئایـەتی (٣٠) دەفەرمویّ ﴿ويمكـرون و يمكر الله والله خـير المـاكرين﴾ واتـە: ئـەوانپیلانـی خۆیـان دەگـێڕن و خوایش پلانـی خـۆی دەخاتـە کـار (بـەپووچ کردنـەوەی کارەکانیـان) ، دڵنیـابن خـوای گـەورە چاکترینی هەموو پلانساز و نەخشەسازانە.

وەلە سورەتی (الطارق) ئایەتی (١٥ و ١٦)دا دەفەرمویّ ﴿إنهم يَكيـدون كيـداً وأكيـدُ كيـداً﴾ واتە: بەڕاستی ئەوانە خەریکی پیلان دانانن و منیش پلان و نەخشەی خۆم دەخەمەکار.

وەلـە سـورەتی (الأعــراف) ئایـەتی (١٨٢ ، ١٨٣)دا دەفــەرمویّ ﴿والذيـن كذبـوا بآياتنـا سَنستدَرجهم من حيث لايعلمون وأُملي لَهم إنَ كَيدي متين﴾ واتە: ئەوانەش کەبەلگـە و بەرنامـەی ئێمە بە درۆ دەزانن لە ئایندەدا وردە وردە بەرەو تیـاچوون دەیانبـەین لـەکات و شـوێنێکدا کـە ئەوان هەستی پیّ ناکەن.

وە لە سوەتی (البقرة) ئایەتی (١٤ و ١٥)دا دەفەرمویّ ﴿قالوا إنا معكم إنما نحن مُستَهزِؤنَ ، اللهُ يَستَهزِئُ بهم﴾ واتە : دووڕووەکان دەڵێن بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین ، بێگومان ئێمـە گاڵتـە بە ئیمانداران دەکەین ، بـەلأم خـەیاڵیان خـاوە، خـوا سزای گاڵتەجاڕیەکـەیان لیّ دەسـتێنێت و دەیانکاتە گاڵتەجاڕ..

هەر بۆیەش دەبینین خوای گەورە باسی ئەوە ناکات هەر کـەس خیانـەت لـەخواو دینەکـەی بکـات خـوای گـەورەش خیانـەتی لیّ دەکـات ، چونکـە (خیانـەت) فێڵێکـە لــەکاتێکدا دەکرێـت کەلایەنی بەرامبەر ئەمین بکرێتەوە ئەمەش سیفەتێکە نەگونجاوە و نـەقس و زەم دەگەیـەنێت و

لەحەقى پەروەردگاردا نابێت بۆیە لە سورەتى (الأنفال) ئایەتى (٧١)دا دەفەرموێ ﴿وإن يُرِيدوا خِيانَتك فقد خانوا الله مِنْ قَبل فأمكنَ منهم والله عليمٌ حكيم﴾ واتە: خۆ ئەگەر بیانەوێ خیانەت و پلان دژ بە تۆ (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)) بگێڕن ، ئەوە بەڕاستی ئەوانە پێشتر خیانەتیان لە خوا كردووە (بەوەی شەریكیان بۆ بڕیار داوە) ئینجا خوا دەسەڵاتی لێ سەندون و ئێوەی زاڵ كردووە بەسەریاندا ، بێگومان خوا زانایە بە (پیلانیان) و دانایە بە (چۆنیەتی سنور دانان بۆیان) ئەوەتا خوای گەورە نافەرموێ خیانەتی لێكردن بەڵكو دەفەرموێ (فأمكن منهم)ئێوەی زاڵ كرد بەسەریاندا. چونكە خیانەت وەك وتمان سیفەتى زەم و نەقسە بۆخودا و ناگونجێ بەكاربهێنرێ.

هەر لێرەیشەوە بۆمان دەردەكەوێ هەندێ عەوام و نەزان ئەم قسە بەتاڵ و بێ مانایە دەكەن كە دەڵێن (خان الله من يخون) واتە هەركەس خیانەت بكات خوای گەورەش خیانەتی لێ دەكات ئەمە قسەیەكی خراپە پێویستە نەهی لێ بكرێت .

**بنەمای دووەم:**

باس و بابەتەكانى سیفات فراوانترن لەبابەتەكانى ناوە پیرۆزەكان ،چونكە هەموو ناوێك سیفەتێك لەخۆ دەگرێت وەك لەبنەمای دووەمی ناوە پیرۆزەكاندا باسمان كرد.

لەبەرئەوەی هەندێ لە سیفاتەكانى خوا (ﷻ) پەیوەستە بە كردارەكانى خواوە –سبحانه وتعالى– وەكردارەكانیشی بێ سنورەو تەواو نابێت، هەروەك چۆن قسە جوان و موبارەكەكانى تەواو نابن ، وەك لە سورەتى (لقمان) ئایەتى (٢٧) دەفەرموێ ﴿ ولو أَنما في الأرض مِنْ شَجرة أقلامٌ والبحر يَمُدهُ مِنْ بعده سَبعة أبحُرٍ ما نَفِدت كلماتُ الله ، إن اللهَ عزيز حكيم﴾ واتە: خۆ ئەگەر بەڕاستی هەرچی درەخت هەیە لە زەویدا ببنە پێنوس ، دەریاش چەندە ببێتە حەوت ئەوەندە و ببێتە مرەكەب و زانستی دروستكراوەكانى خوا بنوسێتەوە، ئەوە هێشتا زانست و فەرمانەكانى خوا هەر تەواو نابێت ، بەڕاستی خوای گەورە بە دەسەڵاتە و دانایە..

بۆ نمونە لە سیفاتەکانی خوای گەورە ( المجيء والأتيان) هاتن بە دەمەوە (والأخذ والأمساك) واتە گرتن و تۆڵە لێسەندنەوە (و البطش) واتە سزادانی توند...هتد. بەڵگەشمان بۆ ئەو سیفاتانەی سەرەوە سورەتی (الفجر) ئایەتی (٢٢)دا ﴿وجاء ربك﴾ واتە (پەروەردگارت دێت) بەڵام چۆنیەتیەکەی خۆی نەبێت کەس نازانێ .

هەروەها لە سورەتی (البقرە) ئایەتی (٢١٠) دا دەفەرموێ ﴿هل يَنظُرون إلا أن يَأتيهم الله في ظُلَلٍ مِن الغَمام﴾ واتە ئایا ئەوانەی ڕێبازی ئیسلامیان ناوێت چاوەڕێی چی دەکەن؟ جگە لە هاتنی خوای گەورە بۆ لایان لە نێو سێبەری پەڵە هەوری سپیدا .

وە لە سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١١)دا دەفەرموێ ﴿فأخذَهم الله بذنُوبهم﴾ واتە: خوایش ئەوانی بە هۆی گوناهو تاوانیانەوە بە توندی سزا داو گرتنی.

هەروەها لە سورەتی (الحج) ئایەتی (٦٥) دا دەفەرموێ ﴿ يُمسك السماء أن تقَع على الأرض إلاّ بأذنه﴾ واتە: خوا (ﷻ ) ئەو زاتەیە کەئاسمان ڕاگیر دەکات لەوەی کە بکەوێ بەسەر زەویدا وە لە سورەتی (البروج) ئایەتی (١٢) دا دەفەرموێ ﴿ إن بطشَ ربكَ لشديد﴾ واتە: بە ڕاستی تۆڵەی پەروەردگارت (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەی ئیماندار ) زۆر توند و تیژ و بە زەبرە..

وە لە سورەتی (البقرە) ئایەتی (١٨٥) دا ئەفەرموێ ﴿ يُريد الله بكم اليُسرَ ولا يُريد بكم العُسر﴾ واتە خوا (ﷻ ) ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت ونایەوێت (پەرستن و فەرزەکانتان) لەسەر قورس بکات . هەروەها پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئەفەرموێ (يَنزِلُ ربنا الى السّماء الدنيا) واتە پەروەردگارمان دائەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا.

جا ئەوەی گرنگە ئێمە وەسفی پەروەردگار دەکەین بەو سیفاتانەی کە چۆن لە قورئان و سوننەت دا هاتوون وەك خۆیان نایانگۆڕین ناڵێین لە ناوەکانی خوا (جاء) ناکەین بە (الجائي) وە (أتى) بکەین بە (الآتي) و (الأخذ) بکەین بە (الآخذ) یا بڵێین (الممسك والباطش والمريد والنازل هتد...)

جا با ئێمەش وەسفی خوا بکەین (ﷻ ) بەو ناو و سیفاتانە..

**بنەمای سێیەم:**

سیفاتەكانی خوا دەبنە دوو بەش :

یەكەم : سیفاتی (ثبوتی) ئەوەی كە خواو پێغەمبەر (ﷺ) سەلماندویانە بۆ خودا (ﷻ).

دووەم : سیفاتی (سلبی) ئەوەی كە خواو پێغەمبەر نەفیان كردووە و دایان ڕنیوە لە پەروەردگار.

**یەكەم: سیفاتی (ثبوتی) :**

هەموو ئەو سیفاتانە دەگرێتەوە كە خوا (ﷻ) لە قورئاندا و لە سەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) دیاری كراون بۆ پەروەردگار و هەموویان سیفاتی كەماڵن و هیچ كەمو كوڕیەك هەڵناگرن وەك سیفاتەكانی (الحیاة والعلم والقدرة والأستواء علی العرش والنزول الی السماء الدنیا و الوجه والیدین ...هتد) جا پێویستە هەمویان بسەلمێنین و هیچ پێچ و لادانێك لە مانا ڕاست و دیارەكانیان نەكەین بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- بەڵگەی قورئان

خوای گەورە لە سورەتی (النساء) ئایەتی (١٣٦)دا دەفەرموێ ﴿ یاأیها الذین آمنوا آمِنوا بالله و رَسوله و الكتاب الذي نَزَّل علی رسولِه و الكتاب الذي أَنزَل من قبلُ ومَن یكفُر بالله و ملائكتِه وكتبه و رسوله والیوم الأخر فقد ضَلَّ ضلالاً بعیداً ﴾.واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەردەوام و دامەزراو بن لەسەر ئیمان بە خوا و پێغەمبەرەكەی و بەو قورئانەش كە لە ماوەی چەند ساڵێكدا دایبەزاندوە بۆ پێغەمبەرەكەی و بەو كتێبانەش كە پێشتر ڕەوانەی كردوون ،جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە خوا و فریشتەكان و بە كتێبەكان و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوای ئەوە بە ڕاستی گومڕا بووە بە ئەوپەڕی گومڕایی ﴾.

جا ئیمان بەخوا تەواو نیە گەر ئیمان بە سیفاتەكانی خودایشی لەگەڵدا نەبێت ، وە ئیمان بە كتێبەكانیش ئەوە دەگەیەنێ كە ئیمانت هەبێ بە هەموو ئەو سیفاتانەی كە لەو كتێبانەدا هاتوون ، وەمادەم ئیمانمان بەوەش هەیە كە محمد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە كەواتە هەرچی فەرموبێت دەربارەی سیفاتەكان لە خوای گەورەی وەرگرتووە و دەبێ باوەڕمان پێی هەبێت .

٢- بەڵگەی عەقڵ

لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی باسی سیفات و ناوە پیرۆزەکانی دەکات و بۆ خۆیشی لە هەموو کەس شارەزاترە دەربارەی خۆی.

وە کەسیش نی یە بە ئەندازەی خوا قسە و فەرمودەی راست و روون بێت .. کەواتە پێویستە بێ گومان و دوودڵی سیفاتەکان جێگیر بکەین و بیسەلمێنین ، هەواڵ و باس و خەبەریش کاتێ وەرناگیرێ کە خاوەنەکەی گومانی (جەهل) یا درۆ یا روون و پاراو نەبوون لە دەربڕینیدا لێ بکرێ ئەم سێ عەیبەش لە خوای گەورەوە زۆر دوورە بۆیە هیچ چارە و رێگەیەك نامێنێ جگە لە تەسلیم بوون بەوەی کە خوای گەورە دەیفەرموێت، هەروەها پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەیفەرموێت [illegible] پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەو سێ عەیبە دوورە بۆیە هەرچی فەرمویێت لێی وەردەگیرێت و قسەی هیچ کەس فەزڵ نادرێ بەسەر فەرمودەی پێغەمبەردا(ﷺ).

دووەم : سیفاتی سەلبی :

ئەو سیفەتانەیە کەخوای گەورە نەفی کردووە لە خۆی کە لە قورئاندا هاتووە یا لەسەر زمانی پێغەمبەری خوادا باس کراون،و هەمویان سیفاتی نەقسن لە حەقی پەروەردگاردا وەك:

(الموت، مردن، النوم، خەو ، الجهل، نەزانی ،والنسیان ، لەیادچوون ، والعجز ، دەستەوسانی ، و التعب ، ماندوو بوون)

بۆیە پێویستە هەموویان نەفی بکرێن لە پەروەردگار و ئەو سیفاتانە بسەلمێنرێ کە دژ و پێچەوانەی هەریەکەیانن ، چونکە کاتێ خوا (ﷻ ) نەفیان دەکات لە خۆی بە مەبەستی تەنها نەفی نی یە چونکە تەنها نەفی سیفاتی کەماڵ نابەخشێ مەگەر کاتێك دژ و پێچەوانەکەشی سەلمێنێ..

بۆنمونە: خوای گەورە لەسورەتی (الفرقان) ئایەتی (٥٨) دا ئەفەرموێ ﴿وتوكل على الحي الذي لا يموت﴾ واتە تەنها پشت بەو خوایە ببەستە کە زیندووە و هەرگیز نامرێ.. کەواتە نەفی مردن لە خوای گەورەیانی کەماڵی ژیان و زیندوێتی بەردەوام.

٢- بەڵگەی عەقڵ

لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی باسی سیفات و ناوە پیرۆزەكانی دەكات و بۆ خۆیشی لە هەموو كەس شارەزاترە دەربارەی خۆی.

وە كەسیش نی‌یە بە ئەندازەی خوا قسە و فەرمودەی ڕاست و ڕوون بێت .. كەواتە پێویستە بێ گومان و دوودڵی سیفاتەكان جێگیر بكەین و بیسەلمێنین ، هەواڵ و باس و خەبەریش كاتێ وەرناگیرێ كە خاوەنەكەی گومانی (جەهل) یا درۆ یا ڕوون و پاراو نەبوون لە دەربڕینیدا لێ بكرێ ئەم سێ عەیبەش لە خوای گەورەوە زۆر دوورە بۆیە هیچ چارە و ڕێگەیەك نامێنێ جگە لە تەسلیم بوون بەوەی كە خوای گەورە دەیفەرموێت، هەروەها پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەیفەرموێت ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەو سێ عەیبە دوورە بۆیە هەرچی فەرموبێت لێی وەردەگیرێت و قسەی هیچ كەس فەزڵ نادرێ بەسەر فەرمودەی پێغەمبەردا(ﷺ).

دووەم : سیفاتی سەلبی :

ئەو سیفەتانەیە كەخوای گەورە نەفی كردووە لە خۆی كە لە قورئاندا هاتووە یا لەسەر زمانی پێغەمبەری خوادا باس كراون،و هەمویان سیفاتی نەقسن لە حەقی پەروەردگاردا وەك:

(الموت، مردن، النوم، خەو ، الجهل، نەزانی ،والنسیان ، لەیادچوون ، والعجز ، دەستەوسانی ، و التعب ، ماندوو بوون)

بۆیە پێویستە هەموویان نەفی بكرێن لە پەروەردگار و ئەو سیفاتانە بسەلمێنرێ كە دژ و پێچەوانەی هەریەكەیانن ، چونكە كاتێ خوا (ﷻ ) نەفیان دەكات لە خۆی بە مەبەستی تەنها نەفی نی‌یە چونكە تەنها نەفی سیفاتی كەماڵ نابەخشێ مەگەر كاتێك دژ و پێچەوانەكەشی بسەلمێنێ..

بۆنمونە: خوای گەورە لەسورەتی (الفرقان) ئایەتی (٥٨) دا ئەفەرموێ ﴿وتوكل على الحي الذي لا يموت﴾ واتە تەنها پشت بەو خوایە ببەستە كە زیندووە و هەرگیز نامرێ.. كەواتە نەفی مردن لە خوای گەورەیانی كەماڵی ژیان و زیندوێتی بەردەوام.

نموونەیەكی تر: لە سورەتی (الكهف) ئایەتی (٤٩) ئەفەرموێ ﴿ ولا يظلم ربك أحداً ﴾. واتە: بێ گومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە كەس ناكات ﴾. كەواتە نەفی ستەم لە پەروەردگار كەماڵی عەدالەت دەگەیەنێ.

نموونەیەكی تر: لە سورەتی (فاطر) ئایەتی (٤٤) ئەفەرموێ ﴿ وما كان الله ليعجزه من شيء في السماوات ولا في الأرض ﴾ واتە ﴿وەنەبێت خوای گەورە هیچ شتێك دەستە و سانی بكات، لە ئاسمانەكان یاله زەویدا﴾، كەواتە نەفی (دەستە و سانی) (عجز) لە خودایانی سەلماندنی كەماڵی عیلم و دەسەلآت بۆی ، ئەوەتا لە كۆتایی ئایەتەكەدا ئەفەرموێ ﴿إنه كان عليماً قديراً﴾. واتە: بەڕاستی پەروەردگار هەمیشە زانایە و بەدەسەلآت و توانایە. چونكە (عجز ، دەستە و سانی) هۆكارەكانی : یا نەزانیی‌یە بە هۆی دروست بوون ﴿الجهل بأسباب الأيجاد﴾ یان كەم دەسەلآتی لەسەری؛ جا مادەم خوای بالآدەست كەماڵی علیم و كەماڵی قودرەتی هەیە كەواتە هیچ شتێك لە دەسەلآتی خوا (ﷻ) بە دەرنیی‌یە و دەستەوسان نی‌یە بەرامبەر هیچ دروست كراوێك نەلە ئاسمانەكان و نەلە زەویدا.

لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە سیفاتی سەلبی چەندەها مانای كەماڵیش دەگرێتەوە.

**بنەمای چوارەم:**

سیفەتە (ثبوتی) جێگیرەكانی پەروەردگار هەموویان سیفاتی مەدح و كەماڵن و هەتا ماناكانیان زۆر و جۆرا و جۆر و قوڵ بن ، زیاتر و ڕوونتر كەماڵی خوا (ﷻ) دەردەخەن.

هەر بۆیە سیفاتە (ثبوتی)یەكان كە پەروەردگار مەدحی خۆی پێ كردوون زۆر زیاترن لە سیفاتی (سەلبی)یەكان.

## سیفاتە سەلبیەکانیش بە زۆری لەم حاڵەتانەدا بەکار هاتوون

یەکەم :

سەلماندن و ڕوون کردنەوەی کەماڵی خوا بەگشتی، وەك لە سورەتی (الشوری) ئایەتی (١٢) دا هاتووە ﴿لیس کمثله شیء﴾ واتە: هیچ دروستکراوێك هاوشێوەی پەروەردگار نی‌یە. وە لە سورەتی (الأخلاص) ئایەتی (٤) ئەفەرموێ ﴿لم یلد ولم یولد﴾ واتە: هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەلأتدارێکی ترنیە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت.

دووەم:

نەفی و ڕەد کردنەوەی ڕاو بۆ چوونی درۆ هەڵبەستان و بێباوەڕان کە لە حەقی خوادا دەدوێن. وەك لە سورەتی (مریم) ئایەتی (٩١-٩٣) داهاتووە ﴿ أَنْ دَعَوا للرحمن ولداً وما يَنبغي للرحمن أن يَتخذَ ولداً﴾. واتە : کاتێك کەنەفامان بوونی ڕۆڵە و نەوەیان دایە پاڵ خوای میهرەبان ، کە هەرگیز ناکرێ و ڕەوا نی‌یە بۆی کە ڕۆڵە و نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات ..

سێیەم:

هەڵوەشاندنەوەی گومانی کەم و کوڕی لە کەماڵی پەروەردگاردا لە ئیش و کارەکانیدا وەك لە سورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (١٦)دا دەفەرموێ ﴿وما خَلَقنا السماءَ والأرضَ وما بینَهما لاعبین﴾ واتە ئێمە ئاسمان و زەوی، هەرچیش لە نێوانیاندا هەیە بە گاڵتەو.. (بەبێ مەبەست) دروستمان نەکردووە.

وە لە سورەتی (ق) ئایەتی (٢٨) دا دەفەرموێ ﴿ ولقد خلقنا السمواتِ و الأرضَ وما بینهما في ستة أیام وما مسّنا مِنْ لغُوب ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە بە شەش ڕۆژ دروستمان کردون و هیچ ماندویەتیەکیش ڕووی تێ نەکردین.

**بنەمای پێنجەم:**

سیفاتە (ثبوتی)یەكانی پەروەردگار دەبێتە دوو بەش:

أ- سیفاتی (زاتی) تایبەت بە زاتی پەروەردگارەوە.

ب- سیفاتی (فعلی) تایبەت بە ویست و كردارەكانی پەروەردگارەوە.

أ-سیفاتی (زاتی): هەموو ئەو سیفاتانەن كە لەگەڵ بوونی خودا (ﷻ) بوون و هەر بەردەوامیش دەبن و بەو سیفاتانە پەروەردگار وەسف دەكرێت. وەك ( العلم = زانین ، القدرة = دەسەلآت ، السمع= بیستن ، البصر = بینین ، والعزة = سەر بڵندی ، والحكمة = دانایی، والعلو = بەرزی ، والعظمة = شكۆمەندی). هەروەها سیفەتی ( خەبەریش) كە خـوای گەورە خۆی بە ئێمەی ڕاگەیاندوە وەك (الوجه = دەم و چاو ، الیدین = دەست ، العینین = هەر دوو چاو ).

ب- سیفاتی (فعلی): ئەو سیفاتانەن كە وابەستەن بە ویست وئیرادەی خوای گەورەوە هەر كات ویستی ئەنجامیان ئەدات و كە نەیشی وویست نایكات وەك (الاستواء علی العرش) واتە: دامەزراوی و ڕاوەستان لەسەر عەرش (بەو شێوەی كە خۆی دەزانێت) یان وەك (النزول الی السماء الدنیا). واتە: دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا. (بەو شێوەیەی كە خۆی دەزانێت)...

وە هەندێ سیفەت دەكرێ بڵێین (زاتی و فعلیش)ە لە دوو ڕووەوە. بۆ نموونە (سیفاتی الكلام) واتە (قسە كردن) سیفەتی زاتیيە و لەگەڵ خوای گەورەدا هەر بووە و دەبێ و كاتێك نەبووە خوا (ﷻ) سیفەتی (قسە كردنی) نەبوبێت.. هەروەا سیفەتی (فعلیشە) چونكە ووشە و ڕستەكان كە لە خوای گەورەوە دەردەچن پەیوەستە بە ئیرادە و ویستی خۆیەوە چ كاتێك بیەوێ و چی بوێت دەیفەرموێت وەك لەسورەتی (یس) ئایەتی (٨٢)دا ئەفەرموێ ﴿إنما أمرُه إذا اراد شیئاً أن یقولَ له كن فیكون ﴾واتە:بێگومان هەر كاتێك فەرمانی خودا دەرچوو ویستی شتێك جێ بەجێ بكات و بهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە ، ئەویش دەست بەجێ پێك دێت و دروست دەبێت..

دیـارە هـەر سـیفەتێكیش وابەسـتەی ویسـت و ئـیرادەی پـەروەردگار بێت لەگـەڵ سـیفەتی (الحكمە) و دانایی خوادا ئەنجام دەدرێت وهیچ كار و كردارێكی خوا بێ حیكمەت نییە جـا ئێمـە حیكمەتەكەی بزانین یا عەقڵمان نهێنیەكەی نەزانێت.

**بنەمای شەشەم:**

سەلماندنی سیفاتەكانی خوا (ﷻ) ئەوەدەخوازێ كە دوو حەرامی گەورە هەیـە دەبـێ وازی لێ بهێنرێ ئەوانیش ( التمثیل) واتە چواندن و هاوشێوە دانـان (التكییـف) واتـە چونێتـی دیـاری كردن.

التمثیـل/ واتـەچواندنی سـیفاتەكانی خـوای گـەورە بـە سـیفاتەكانی مەخلوقـەكان ئەمـــەش باوەڕێكی بەتاڵە بەم بەڵگانەی خوارەوە:

بەڵگەی قورئانی:

خوای گەورە لە سورەتی (الشوری) ئایەتی (١١) دا دەفەرموێ ﴿لیـسَ كمِثلـه شـیء﴾ واتـە هیـچ شتێك نییـە لەوێنـەی زاتـی پـەروەردگار ، چونكـە خـوا بەدیهێنـەرە چـۆن لـە بـەدی هێنراوەاكانی دەچێت؟! وە لە سـورەتی (الأخـلاص) ئایـەتی (٤) دا ئەفـەرموێ ﴿ ولم یكَـن لـه كفوا أحد﴾ واتـە: هـەرگیز هاوتـا و هاوشـێوە و دەسـەلأتدارێكی تـر نیـە كـە لـە بەرامبەریـەوەو هاوشانی بێت..

بەڵگەی عەقڵی:

لە چەند ڕوویەكەوە باسی دەكەین :

أ/ هەموو عاقڵێك ئەوە دەزانێت كە جیاوازی لـەنێوان زاتـی خـالق و زاتـی هـەر مـەخلوقێكدا هەیە، كەواتە: دەبێ جیـاوازی لـە نێـوان سیفاتەكانیشـیاندا هـەبێت ، چونكـە سیفەت پاشـكۆو وابەستەی زاتە، كە لـە بـوون و زاتیـاندا جیـاوازی هـەبێت لەسیفاتەكانیشـیاندا دەبـێ هـەبێت ، هەروەك چۆن زاتی مەخلوقەكان جیاوازە دەبینین سیفاتەكانیشیان هەر جیاوازن

بۆ نمونە: هێزی ووشتر جیاوازە لە هێزی زەڕڕە، جا گەر لەنێوان هێزی دروست كراوەكانیدا هێندە جیاوازی هەبێت ئەدی لەنێوان هێزی مەخلوقاتو خالقدا چەندە هەبێت؟!

ب/ باشە چۆن خوایەکی بەدیهێنەری کامڵ لە هەموو ڕوویەکەوە دەچوێنرێ بە سیفاتی دروستکراوێکی ناتەواو کە زۆر موحتاج بێت بە کەسێك تەواوی بکات و پەروەردەی بکات ؟ چونکە چواندنی زاتێکی کامڵ بە کەسێکی ناتەواو و نوقسان ، لە قودرەتی ئەو زاتە کەم دەکاتەوە و بڕیار دانی (نقص)ە بۆ پەروەردگار پەنا بەخوا.

ج/ ئێمە بە چاوی خۆمان چەندەها مەخلوقات دەبینین کە لەناوەکانیاندا یەکسان و چون یەکن بەڵام لە حەقیقەتی بوون و چۆنیەتیاندا جیاوازن، بۆ نمونە دەبینین ئینسان و فیل هەردووکیان خاوەن دەستن بەڵام بوون و چۆنیەتی دەستەکان جیاوازن، هەروەها فیل و حوشتر هەردووکیان خاوەنی (هێزن) بەڵام جیاوازی لە نێوانیاندا زۆرە لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەهاوشێوەیی و یەکسانی لە (بووندا) نابێ ببێتە مەرج بۆ هاوشێوەیی لە سیفات و ڕاستی دا.

(والتشبیه کالتمثیل) واتە: شوبهاندن وەك هاوشێوە دانان وایە، بەڵام هەندێك جار جیادەکرێتەوە بۆیە دەڵێن (التمثیل) یانی هاوشێوە دانان لە هەموو سیفاتەکاندا واتە بوترێ سیفاتەکانی پەروەردگار هەمویان هاوشێوەی سیفاتی مەخلوقاتن بەڵام (التشبیه) واتە شوبهاندنی زۆربەی سیفاتەکانی پەروەردگار بە سیفاتی مەخلوقات هەر بۆیەش خوای گەورە لە سورەتی (الشوری) ئایەتی (١١) دا بە شێوازی (نفی التمثیل) بۆ ئەوەی نەفی هەموو شێوە دانانێك لە هەموو سیفاتەکاندا بکات دەفەرموێ ﴿لیس کمثله شیء﴾.

دێینە سەر (التکییف) واتە : سەلماندن و دیاریکردنی چۆنیەتی سیفاتەکانی پەروەردگار بەوەی بوترێ بە فلان شێوە و فلان شێوەی ترە ! یا هاو شێوەشی بۆ دیاری نەکات!

ئەمەش بیر و ڕایەکی بەتاڵ و دوور لە بەڵگەیە ، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

لەسورەتی (طه) ئایەتی (١١٠) دا دەفەرموێ ﴿ ولا یحیطون به علماً﴾ واتە: ئەو خەڵکە هەرگیز ناتوانن ئاگاداری چۆنێتی زانست و زانیاری بێ سنووری ئەو زاتەبن. وەلە سورەتی (الأسراء) ئایەتی (٣٦)دا ئەفەرموێ ﴿ ولا تَقفُ مالیس لك به علم إن السمعَ و البصرَ و الفؤاد كلُ أولئك كان عنه مسؤولاً﴾. واتە: ئەی ئینسان لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە ، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەر پرسیارە لە بەرامبەریەوە.

شتێکی دیـار و بەڵگـە نەویستە کـە ئێمـە هیـچ زانسـت و زانیاریـەکمان نیـیە بـە چۆنێتـی سیفاتەکانی پەروەردگار ، چونکە خوای گەورە ئێمەی تەنها لە سیفاتەکان ئاگـادار کردوە نـەك لە چۆنێتی یەکەی. کەواتە هەر هەوڵدان و بیرکردنەوەیەك بۆ زانینی چۆنێتی هەر سیفاتێك ، لـە سنور دەرچوون و زیادە ڕەوییە.

بەڵگەی عەقل:

هەرگیز چۆنێتی سیفاتی هیچ مەوجودێك نازانرێت هەتا وەکو چۆنێتی (زاتی) ئەو مەو جودە نەزانرێت . یا لە ڕێگای کەسێکی ڕاستگۆوە وەك (الخبر الصـادق) پێمـان بگەیـەنێ دەی بـەهیچ کام لەم ڕێگانـە چۆنێتـی سیفاتەکانی خـوا (ﷻ ) بـۆ ئێمـە بـاس نـەکراون بۆیـە پێویستـە لێی بێدەنگ بین. دیاری کردنی هەر جۆرێك لە (چۆنێتی) سیفاتەکان لە مێشکی خۆتدا ، هەرگیز بەو شێوە و چۆنێتییە دەرناچێت و خوا (ﷻ ) زۆر لەوە گەورە تر و بـاڵا دەست تـرە کـە مێشـکی لاواز و تەسکی مرۆڤەکان پەی پێ بەرن و هەر چیش لەم بارەیەوە بوترێ درۆ و بێ بەڵگەیە..

هەر بۆیە کاتێ پرسیار کرا لـە ئیمامی مـالیك -ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت- لـە بـارەی ئـەم ئایەتەوە ﴿ الرحمن علـى العرش استوى﴾ کیـف إستوىٰ؟ لـە وەڵامـدا ئیمـامی مـالیك سـەری دانەواند و عارەقێکی زۆری کرد و فـەرمووی ﴿ الأستواء غـيرُ مجهول و الكيـف غـيرُ معقـول ، و الأيمانُ به واجب ، والسؤالُ عنه بدعة﴾. واتـە: (الأسـتواء) ڕاوەستان لەســەر تـەختی فـەرمان ڕەوای و عەرش حەقیقەتی هەیە و نادیار نییە ، و چۆنێتی یەکـەی شـاراوەیە و پرسـیار کردن دەربارەی چۆنێتی (اسـتواء) بیدعەیە و باوەڕ بوون پێی واجبە.

هـەروەها شـێخی ئیمامی مالیك کـە نـاوی (ربیعـە)یـە دەڵێـت ﴿ الاســتواء غـير مجهول و الكيف غير معقول ﴾. واتە: (استواء) نـادیـار نییە بەڵام چۆنێتـی یەکـــەی شاراوەیە و نـابێ پرســـیار دەربارەی بکرێت.

بۆیە دەبینین زانایانی پاشتر لەسەر تێگەیشتنی ئەم دوو ئیمامە بەڕێزە ڕۆشتوون ، کەواتە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی و عەقڵی بۆ (کیفیـە) چۆنێتـی دیـاری کردنـی سیفاتەکان نـیـیە و هـەر هەوڵدانێکیش لەم بوارەدا هـەڵنانی شـەیتانە و جـوان کردنـی تاوانێکـە ئینسـانەکان بـە هیلاکدا دەبات و تەنها پشـت و پـەناش خـوای میهرەبانـە وەك لـە سـورەتی (الأعـراف) ئایـەتی (٢٠٠)دا

دەفەرموێ ﴿ وإما ينزغنك من الشيطان نزغٌ فاستعذ بالله إنه هو السميع العليم ﴾. واتە: ئەگەر وە سوەسەیەكت لە لایەن شەیتانەوە بۆ پێش هات و ویستی لە خشتەت بەرێت و تووشی هەڵەت بكات ، جا ئەوە تۆ پەنا بگرە بە خوا چونكە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینەرە.

**بنەمای حەوتەم:**

سیفاتەكانی خوا (ﷻ ) (توقيفيه) واتە ئەوەندەن كە دەقە شەرعیەكان دیاری كردون و مۆڵەت بە عەقڵ نەدراوە قسەیان تێدا بكات..

ئێمە ناتوانین هیچ سیفەتێك دیاری بكەین بۆ خوای گەورە مەگەر ئەوانەی كە لە قورئان و سوننەتدا دیاری كراون. ئەوەتا ئیمامی ئەحمەد -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لە بنەمای پێنجەمدا لە باسی (ناوە پیرۆزەكاندا) ئەفەرموێت ﴿ هەرگیز نابێ خوای گەورە وەسف بكرێ بە سیفەتێك مەگەر ئەو سیفەتە خۆی لە قورئاندا دیاری بكرێت یا پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی كرد بێت..

بەڵگە و ئاماژەی قورئان و سوننەتیش بۆ دیاری كردن و سەلماندنی هەر سیفەتێك بە یەكێك لەم سێ شێوەیە دەبێت ..

یەكەم:

ڕاستەوخۆ ئاماژە كردن بەو سیفەتە وەك سیفەتی (العزة : سەربەرزی ، القوة : هێز و دەسەلآت ، الرحمة : بەزەیی و میهرەبانی ، والبطش : توندی لە سزادان ، الوجه : دەم و چاو ، و اليدين : هەردوو دەست )

دووەم:

هەر ناوێك كە سیفەتێك لە ماناكەیدا لەخۆ بگرێت وەك ناوی (الغفور) .. كە لە ماناكەیدا سیفەتی (المغفره) واتە لێخۆشبوون لە خۆ دەگرێت. وە ناوی پیرۆزی (السميع) كە لە ماناكەیدا سیفەتی (السمع) واتە بیستن لە خۆ دەگرێت. سەیری بنەمای سێ یەم بكە لە باسی ناوە پیرۆزەكاندا .

سێ یەم:

بە ڕاشکاوی باسی کردەوەیەك یا وەسفێك بکرێت کە بەڵگە بێت لەسەر ئەو سیفەتە بۆ نمونە (الأستواء على العرش) سیفەتی (الأستواء) بە ڕاشکاوی لە قورئاندا هاتووە یا (النزول إلى السماء الدنيا) بە ڕاشکاوی لە فەرمودەدا هاتووە یا (المجيء للفصل بين العباد يوم القيامة) سیفەتی (المجيء) بەڕاشکاوی لە فەرمودەکاندا هاتووە هەروەها (الأنتقام من المجرمين) بە ڕاشکاوی لە قورئاندا هاتووە بەڵگەی هەریەك لەمانەی سەرەوەش بە شوێن یەکدا بەم شێوەیە ، لە سورەتی (طه) ئایەتی (٥) ئەفەرموێ ﴿ الرحمن على العرش استوى﴾ پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئەفەرموێ: (ينزل ربنا الى السماء الدنيا). وە لە سورەتی (فصلت) ئایەتی (٣٦)دا ئەفەرموێ ﴿ وجاء ربُّك و المَلَكُ صفاً صفاً ﴾ وە لە سورەتی (السجدة) ئایەتی (٢٢) ئەفەرموێ ﴿ إنا مِن المجرمين مُنتقمون﴾...

# چەند بنەمایەك بۆ سەلماندنی بەڵگەكانی سیفات و ناوە جوان و پیرۆزەكانی خوا (ﷻ)

**بنەمای یەكەم:**

ئەو بەڵگانەی كە سیفات و ناوە جوانەكانی خوای گەورەی پێ دەسەلمێت.. تەنها ئەو بەڵگانەی كە لە قورئان و سونەتدا هاتوون و ، هەر بەڵگەیەك لەم دوو سەرچاوەدا هاتبێ واجبە ئیمانی پێ بهێنین و بیسەلمێنین ، وەهەر ناو و سیفاتێك نەفی كرا بێت پێویستە ئێمەش نەفی بكەین لەگەڵ سەلماندنی كەماڵی پێچەوانەكەی ، وە هەر ناو و سیفاتێك نەبە نەفی و نەبە جێگیر كردن و سەلماندنن باسی نەهاتبێت پێویستە ئێمەش (توقف) لەسەری بكەین و باسی نەكەین بەڵام بۆ مانا و مەبەستی هەر (ناو و سیفەتێك) كە لێی وەربگیرێ گەر مەبەست بەو مانایە سەلماندنی پاكی و دەسەڵات بوو بۆ پەروەردگار ئەوە قەبوڵ دەكرێ و گەر مەبەست و ماناكەش لایەق نەبوو بۆ زاتی پەروەردگار پێویستە ڕەد بكرێتەوە.

جا لەوانەی كە پێویستە (إثبات) و جێگیر بكرێ بۆ پەروەردگار هەموو سیفاتێك كە لە ناوێك لە ناوە جوانەكانەوە وەربگیرێ ئیتر ڕاستەوخۆ یا بە لێوەرگرتن بێت.

وە هەر سیفاتێك كە (دلّ عليها فعل من أفعاله تعالى) كردارێك لە كردارەكانی خوای گەورە ئاماژەی پێ بدات وەك ﴿ الاستواء على العرش، و النزول الى السماء الدنيا ، و المجيء للفصل بين عباده يوم القيامة ﴾، وە هەر شتێكی‌تر لەم شێوە كردارانەی پەروەردگار كە جۆرەكانی نایەنە هەژمار ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿ويفعل الله مايشاء﴾.

هەروەها ( الوجه و العينان و اليدان و الكلام و الأراده). بە هەر دوو جۆرەكەی (الأرادة الكونية و الأرادة الشرعية: واتە لە دروست كردنی بوونەوەر و یاسای بەڕێوەبردنی لەگەڵ فرمان و بڕیارە شەرعیەكان بە حەرام و حەڵاڵ‌ كردنی بوێت وا دایڕشتوە.. هەروەها سیفاتەكانی (الرضا والمحبة والغضب والكراهه).

وە لـەو سیفاتانەی كـە نـەفی دەكرێـن لـە پـەروەردگار و بـە نـەفی كردنیـان كـەماڵی پێچەوانەكەی دەردەكەوێت وەك (الموت ، النوم ، والعجز ، والأعیاء ، والظلم ، والغفلة)..

وە لەو سیفاتانەش كە بە(نەفی یا إثبات ) باسیان نەهاتووە وەك لە فـرزی (الجهـە) جا گـەر یەكێك پرسیار بكات و بڵێت ئایا دەتوانین (جهة) بۆ خوا دیاری بكەین؟ دەڵێین لە فرزی (جهە) لە قورئان و سوننەت دا نەهاتووە نەبە(نەفی) نەبە(إثبات) ئەوەندەش بەسە كە (ثابت) بووە خوای گەورە لە ئاسمانە مانای لە (ئاسمان) بونیش ئەوە نی‌یە كـە ئێمـە شـوێنی سـەر یـان خـوار كـە خوای گەورەی تێدابێت دیاری بكەین چونكە خوا (ﷻ ) لەوە گەورەترە كە مەخلوقاتێكی خـۆی دەوری بدات بـەڵكو مەبەسـت لـە ئاسمـان ئـەوەیـە كـە خـوا (العلـی فـوق خلقـە) بڵنـد و بـەرزە لەسەروی هەموو مەخلوقاتیەوەیە.

## بەڵگەی ئەم بنەمایەش قورئان و عەقڵە.

### بەڵگەی قورئان:

﴿ وما آتكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا﴾ واتە: هەر ڕێنمایی و بڕیارێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی هێناون جیّ‌بەجیّ ی بكەن و هەر شتێكیش نـەهی لێدەكـات وازی لیّ بهێنن .. لـە ئایەتێكی تردا ئەفەرمویّ ﴿ وأن احكم بينهم بما أنزل الله ولا تَتَبِعْ أهوائهم ﴾ قورئان بكەرە بڕیار و حوكمی پیّ بكـە و شـوێنی هـەواو ئـارەزووی ئەوانـە مەكـەوە.. هـەروەها ئەفـەرمویّ ﴿ فـإن تنازعتُم في شيءٍ فردُوهُ الى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بـالله و اليـوم الأخـر ذلـك خـير وأحسـن تأويلا﴾ واتە: ئەگەر لە شتێكدا بوو بە كێشەتان ئـەوە ئـەو كێشـە یە بگێڕنـەوە بـۆ لای خـوا و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) گەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، ڕەفتـار كردنتـان بـەو شێوەیە چاكترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری كێشەكانتان ، ئەمانە و چەندەها دەقی تریش لەم بارەیەوە زۆرن كە داوا لە باوەڕ داران دەكەن ، ئیمانیان ببێت بـەوەی لـە قورئـان و سوننەت دا هاتووە، جا هەر دەقێك ئاماژە بە پێویستی ئیمان بوون بكات بەوەی كە لە قورئاندا هاتووە هەر هەمان دەق ئاماژەیشە بە پێویستی ئیمان بوون بەوەی كە لە سوننەت دا هـاتووە، چونكە لە قورئاندا هاتووە كە داوامـان لیّ دەكـات شـوێنی پێغەمبـەر بكـەوین (ﷺ) وە لـە كـاتی

كێشە و گرفتەكاندا بگەڕێینەوە بۆ بڕیار و فرمانى پێغەمبەرى خـوا (ﷺ) كـاتێ لـە ژیـاندا بـوە و ئێستاش بۆ لاى سونەتەكانى.

جا ئیمـان بـە قورئـان لـە كوێدایە گـەر كەسێك خـۆى لـەوە بـە گـەورەتر بزانێـت شـوێن پێغەمبەر(ﷺ) بكەوێت كە لە قورئاندا ئەمرى پێ كراوە؟!

وە ئیمـان بـە قورئـان لـە كوێدایـە گـەر كەسـێك نـیزاع و كێشـەكان نەگێڕێتـەوە بـۆ لاى پێغەمبەر(ﷺ) كە لەقورئاندا ئەمرى پێ كراوە؟!

وە ئیمان بە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) لە كوێدایە كە قورئان فرمانى پێ كردووە بۆ كەسێك كـە سونەتەكانى پێغەمبەر ڕەد دەكاتەوە؟! بۆیە خواى گەورە لە سورەتى (النحل) ئایەتى (٨٩)دا ئەفەرموێ ﴿ ونزلنا عليك الكتاب تبياناً لكل شيء ﴾. واتە: قورئانمـان بـۆ تـۆ ئـەى محمـد (ﷺ) دابەزاندووە ڕونكـەرەوەى هـەموو شتێكە ﴾ گومانیشـى تێدا نىیـە كـە زۆرێك لـە فرمانـەكانى شـەریعەت بـە دوو بەشـى ( علمى و عملى)یـەوە لـە سـونەتدا ڕونكردنـەوەیان بـۆ هـاتووە ، ڕونكردنەوەى سونەتیش لە ڕوانگەى قورئانەوە هاتووە.

## بەڵگەى عەقڵ:

ئەمەیكە: هەموو شیتەڵ كردنەوە و ڕونكردنەوەیەك كە لە حەقى خـواى گـەورەدا بـۆ ئێمـە هاتبێت لەوانەى كە واجبن یا نەگونجاو و حەرامن یا دروستن. هەموویان لە كاروبارى (غەیب)ن و عەقڵى مرۆڤەكان پەى بێ نابات .. بۆیە واجب ئەوەیە كە بگەڕێینەوە بۆ لاى قورئان و سوننەت و شوێن هەواو خەیاڵ و گومان نەكەوین...

## بنەماى دووەم:

ئەرك و واجبى موسڵمانان بەرامبەر دەقەكانى قورئان و سوننەت ئەوەیە كە تەسلیمى مانا و ڕاڤە زاهیر و دیارەكانى بین بێ هیچ لادان و پێچ و پەنایەك لە ماناى زاهیرى دەقەكان بەتایبـەت ئەو دەقانەى باسى سیبفاتەكانى خوا (ﷻ ) دەكەن كە بەهیچ شێوەیەك مۆڵەت و تواناى عـەقڵ نىیە كە قسەى تێدا بكات. بەڵگەشمان قورئان و عەقڵە.

١-بەڵگەی قورئان:

لە سورەتی (الشعراء) ئایەتەكانی (١٩٣-١٩٤-١٩٥)دا ئەفەرمویّ ﴿نزل به الروح الأمين على قلبك لتكـون مـن المنذرين بلسـان عربـي مبـين﴾ واتـە: جوبرەئیلـی ئـەمین (فریشـتەی وەحـی) دایبەزاندوە ، بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد (ﷺ) تابچیتە ڕیـزی ئـەو كەسـانەوە كە خـەڵكی بێدار دەكەنەوە بە زمانی عەرەبی ڕوون و ئاشكرا یا بە زمانێكی پاراوو شیرین .

لە سورەتی (الزخرف) ئایەتی (٣) دا دەفەرمویّ ﴿ إنا جعلناه قرآناً عربياً لعلكم تعقلـون ﴾. واتە: ئێمە ئەو كتێبەمان كردووە بە قورئانێك بە زمانی عـەرەبی بـەڵكو ژیـری و بـیر و هۆشـتان بخەنە كار (تاڵیّ تیّ بگەن و پەیڕەوی بكەن).

ئەم ئایەتانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە پێویستە ئێمە لەسەر مانا زاهیریەكـەی ڕاوەسـتین كە زمانی عەرەبی ڕوونی دەكاتەوە مەگەر كاتیّ بەڵگەیەكی شەرعی‌تر ڕێگامان لیّ بگرێـت بـەرەو مانایەكی ترمان ببات.

هەر بۆیەش خـوای گـەورەزەمی جوولەكـە دەكـات چونكـە مانـای ئایەتـەكانی خوایـان لاداو گۆڕیان بۆ مەبەستێكی‌تر!

بۆیـە بـەدورترین كـەس لـە ئیمانـــەوە دانــراون وەك لەسـورەتی (البقــرة) ئایــەتی (٧٥)دا ئەفەرمویّ ﴿أفَتَطمَعُون أن يؤُمِنوا لكم وقد كان فريق منهم يَسمعون كلامَ الله ثم يُحَرِّفونه مـن بعد ما عقلوه وهم يعلمون ﴾ واتە: ئایا ئێوە (ئەی ئیمانداران) بەتەمان و ئومێـدەوارن كـە جوولـەكە ئیمان بهێنێت بـە ئاینەكـەی ئێـوە لـە كـاتێكدا دەسـتەیەك لـە شـارەزایانیان گوفتـاری خوایـان دەبیست لە (تەورات)دا ، لەوەو دوا دەستكاریان دەكرد و لە مانا و مەبەستی ڕاستی خۆی لایان دەدا دوای ئەوەی كە تێی گەیشتبوون و دەیانزانی ڕاستیەكەی كامەیە...)

٢-بەڵگەی عەقلّ:

بیّگومان ئەوەی (دەقـە) شـەرعیەكان دەفـەرمویّ كـە (خـوای گـەورە و پێغەمبـەرْ(ﷺ)) لـە هەموو كەس باشتر ماناو مەبەستی دەقەكان دەزانیّ، خـوای گـەورەش بـەزمانی ڕوون‌و پـاراوی عەرەبی ئایەتەكانی بۆ ناردوین، بۆیە واجبە لەسەرمان مانا ڕوون و زاهیرەكەی وەربگرین، گەرنا جیاوازی لە ڕاوتەفسیرەكاندا دەبێت و پاشتر دەبێتە مایەی تەفرەقەی ئومەتی ئیسلامی.

**بنەمای سێیەم:**

ئەو دەقانەی باسی سیفات دەكەن لە زاهیردا ڕوون و مەعلومن بۆ ئێمە لە ڕووی مەعناكەیەوە، بەڵام لە ڕووی (چۆنێتی)یەوە نادیارن.

**بە بەڵگەی دەقە شەرعیەكان و عەقڵ**

**١- بەڵگەی دەقە شەرعیەكان (النصوص الشرعية)**

خوای گەورە لە سورەتی (ص) ئایەتی (٢٩)دا ئەفەرموێ ﴿ كتاب أنزلناه إليك مبارك ليدبروا آياته وليتذكر إولو الألباب ﴾ واتە: ئەم قورئانە كتێبێكی پیرۆزە دامانبەزاندوە بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی ئایەتەكانی لێك بدەنەوەو بیری لێبكەنەوەو بۆ ئەوەی خاوەن بیرو هۆشەكان پەندو ئامۆژگاری وەرگرن‌و تێفكرن).

وە لەسورەتی (الزخرف) ئایەتی (٣)دا ئەفەرموێ ﴿ إنا جعلناه قرآناً عربياً لعلكم تعقلون﴾. واتە: ئێمە ئەو كتێبەمان كردووە بەقورئانێك بەزمانی عەرەبی بەڵكو ژیریو بیرو هۆشتان بخەنە كار تالێی تێبگەن‌و پەیرەوی بكەن).

گومان لەوەدا نییە ووشەی (تدبّر) كە لەئایەتی پێشتردا هاتووە گەر (فهم)و تێگەیشتنی ئینسان دەركی نەكات نەدەگوترا ، وە دابەزاندنی قورئان بە زمانی عەرەبی بۆ ئەوەیە كە ئەوانەی زمانی عەرەبی شارەزان چاك لێی تێبگەن وە مانا و مەبەستەكانی مەعلوم بێت لایان، گەرنا جیاوازی نەدەبوو لەوەی كەبەزمانی عەرەبی بێت یان نا؟

هەروەها شەرح و ڕوونكردنەوەكانی پێغەمبەریش(ﷺ) بۆ قورئان گشگیر بووە لەڕوون كردنەوەی هەردوو لایەنی (لفظ)و (معنى).

**٢-بەڵگەی عەقڵ**

شتێكی مەحاڵ‌و نەگونجاوە كەخوای گەورە بەرنامەیەك دابەزێنێت بۆ هیدایەتی هەموو خەڵكو بەرنامەكەش لەخواو پێغەمبەرەوە ئاراستە بكرێت‌و گرنگترین باسیش باسی ناوو سیفات‌و دەسەڵاتی پەروەردگار بێت‌و ئەمیش نادیار و نا مەعلوم بێت بۆ خەڵك؟؟ هەر وەك چۆن پیتە (هیجائیەكان) بە تەنها هیچ مانایەكیان نییە؟؟ دیارە شتی وا لەگەڵ حیكمەتی

پەروەردگار و حیكمـەتی ناردنی پێغەمبـەران و -علیهم السـلام- و بەرنامـەكانیاندا نـاگونجێو عەقلی سەلیمیش نایسەلمێنێ.

خوای گەورەش لەسورەتی (هود) ئایەتی (١)دا دەفەرموێ ﴿ كتاب أُحكمت آياته ثم فصلت من لدن حكيم خبير﴾ واتـە: ئـەم قورئانـە كتێبو پەیامێكـە ئایـەتو باسـاكانی بـە شـێوەیەكی مەحكەم جۆش دراون، پاشان درێژەیان پێ دراوە و ڕوون كراونەتەوە لەلایەن زاتێكەوە كە داناو بەئاگاو لێزانە..).

ئەمانەی پێشوو هەمووی بەڵگەكانی دەقە شەرعیەكان و عەقڵیبوون لەوەی كە ئێمە زانیمان سەبارەت بە ماناو مەبەستی (نصوص الصفـات) دەقـەكانی سیفات بـەڵام بەڵگـە و ئاماژەكـانی دەقە شەرعیەكان و عەقڵ لە ڕووی زانینی (چۆنیـەتی) ئایەتـەكانی سیفاتەوە، ئـەوە ئێمـە لێی نازانینو پەروەردگار باسی چۆنێتی بۆ نەكردووین، هـەروەك لـە(بنـەمای شەشـەم) لەبنـەماكانی باسی سیفات دا ئاماژەمان پێكرد..

لێرەوە بێ بەڵگەیی و بەتاڵی (مذهب المفوضة) واتە: ئەوانەی مانـا و مەبەسـتی (دەقـەكانی سیفات) دەگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگار و واش گومان دەبەن كە ئەوە (مذهب)و ڕچەی سـەلەف بێت؟؟ لەڕاستیشدا (مذهب السـلف) وا نیـیە و بـەرین لـەو بۆچوونـە، بـەڵكو مەزهـەبی سـەلەف ئەوەیە كە: ماناو مەبەستی دەقـەكانی سیفات جێگیر دەكـەن و دەیسـەلمێنن، بـەڵام چۆنێتـی سیفاتەكان دەگێڕنەوە (تفویض) بۆ عیلمی پەروەردگار.

ئـەوەتا شـێخی ئیسـلام ئیبنـو لتەیمیـە لـە كتێبـە بـەناو بانگەكـەی (العقـل و النقـل)دا كـە لەپەراوێزی كتێبی (منهاج السنة)دا چـاپكراوە لـە ج١ لاپـەڕە (١١٦)دا دەڵێـت ﴿ وأمـا التفويـض فمن المعلوم أن الله أمرنا بتدبر القرآن وحضنا على عقله وفهمه ، فكيف يجوز مع ذلك أن يراد منا الأعراض عن فهمه ومعرفته وعقله﴾ واتە : سەبارەت بە (تفویض) گومان لەوەدا نیـیە كـەخوای گەورە فەرمانی بەئێمە كردووە لەقورئان ورد ببینەوەو هەڵیناوین كە عەقڵمان بخەینـە گـەڕ بـۆ چاكتر تێگەیشتن لێی، جا كـەوابێ چۆن دروستە داوا بكـرێ لـە ئێمـە كـە گـوێ نـەدەین بەشارەزابوونو تێگەشتنی ئایەتەكانی سـیفات؟؟؟) پاشـتر شـێخو لئیسـلام لەلاپـەڕە (١١٨)دا دەفەرموێ ( و حينئذ فيكون ما وصف الله به نفسه في القرآن أو كثير مما وصـف الله بـه نفسـه لا

يعلم الأنبياء معناه، بل يقولون كلاماً لا يعقلون معناه ومعلوم أن هذا قدح في القرآن والأنبيـاء، إذ كان الله أنزل القرآن وأخبر أنه جعله هدى وبياناً للناس وأمر الرسـول أن يبلـغ البلاغ المبـين وأن يبيّن للناس ما نزل إليهم وأمر بتدبر القرآن وعقله ومع هذا فأشرف ما فيه وهو ما أخـبر بـه الرّب عن صفاته)

واتە: ئەگەر بەو شێوەیە بێـت ئـەهلی (تفویـض) دەڵێـن كـە: مانـا و مەبەسـتی ئایەتـەكانی سیفات تەنها خوا دەیزانێ و نابێ ئێمە قسەی لەسەر بكەین؟؟ ئەو كاتە دەبـێ بوتـرێ : كەئـەو وەسیفانە خوای گەورە بۆ خۆی داناوە لە قورئاندا پێغەمبەران –سەلامی خوایان لەسـەر بێت– هیچ لەماناكەی نـازانن و ئـەوەی دەیڵێـن بێئاگـان لێ؟؟ ئـەم قسـەیەش تومـە و تانەیەكـە لـە قورئان و لە پێغەمبەرانیش؟؟

پەنا بەخوا.. چونكە خوای گەورە قورئانی نازڵ كـردووە و مەبەسـتی پـێی هیدایـەت دانـی مرۆڤـەكان و ڕوونكردنـەوەی ڕاسـتیەكانە، هـەروەها فرمانیشـی كـردووە بەپێغەمبــەر (ﷺ) كـە هەستێ بەتەبلیغی تەواو ڕوون كردنەوەو شیتەڵ كردنی قورئان بۆ مرۆڤایـەتی و داوای لەخـەڵك كـردووە كـە تێبفكرێـن لـەقورئان، وماناكـانی چـاك بزانـن.. جـا باشــترین و بــەڕێزترین بابــەتی قورئانیش بریتیە لەوەی كە خوای گەورە باسی ناوو سـیفاتە بـەرزەكانی خـۆی كـردووە و جـا گەر وابێ ئەهلی (تفویض) دەڵێن؟ مەحرومین لە بەڕێزترین و گرنگترین بابەتی قورئـان و نـازانین ماناكەی چییە؟؟ شتی وەهایش نەگونجاوە؟

بەڕاستی قسەكانی شێخو لئیسلام بەهێزو دروستن و لەڕاو بۆچونێكی پێگەیشتوو فراوانــەوە دەرچوون و پێویست بەزیاتر ڕوونكردنەوە ناكات.. باڕانی ڕەحمەتی خـوا بـرژێ بەسـەر شـێخو لئیسلامدا و لەبەهەشتدا ئێمەش لەگەڵ ئەودا كۆبكاتەوە..

**بنەمای چوارەم:**

ماناو مەبەستی زاهیری دەقەكانی سیفات كە ڕاستەوخۆ دێنە مێشكی خوێنەر، ئەوە جێگای ئیعتیبارە)) بەڵام بەپێی سیاقی ئایەتەكان ماناكانی دەگۆڕێن ، وە هەروەها بەپێی پێكهێنانی ڕستە و جوملەكان لە جارێك بۆ جارێكیتر دەگۆڕێن، بۆ نموونە ووشەی (القریـة) كـە لـەقورئاندا

هاتووە جارێك مەبەست پیێ (كۆمەڵێك خەڵكە) و جارێكیتر مەبەست پیێ (شوێن و جێگای قەومێكە).. لە سورەتی (الإسراء) ئایەتی (٥٨)دا هاتووە كە مەبەست بە (القریة) شوێن و جێگایانە وەك ئەفەرموێ ﴿ وإن من قریة إلا نحن مهلكوها قبل یوم القیامة أو معذبوها عذاباً شدیداً ﴾. واتە: (هیچ شارو شارۆچكەیەك نییە كە ئێمە بڕیارمان دابێت پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت لە ناوی بەرین یان سزایەكی سەختی بدەین لە كتێب و دۆسیەی تایبەتدا (لوح المحفوظ)دا تۆمار نەكرابێت.

هەروەها لە سورەتی (العنكبوت) ئایەتی (٣١)دا سەبارەت بە (القریة) كە بۆ كۆمەڵێ خەڵك بەكار هاتووە دەفەرموێ ﴿ إنا مهلكوا أهل هذه القریة﴾. واتە: (بەڕاستی ئێمە لە ناوبەری خەڵكی ئەم شارە ین).

هەروەها كاتێك دەڵێیت: من ئەم شتەم بە هەر دوو دەستی خۆم دروست كردووە، دیارە ئەم دەستە وەك ئەو دەستە نییە كە خوای گەورە لەسورەتی (ص) ئایەتی (٧٥)دا ئەفەرمووێ ﴿ لما خلقتُ بیديّ ﴾. واتە: ئادەم پێغەمبەر (ڕەزای خوای لێبێ) بەدەستی خۆم دروستم كردووە). چونكە (دەست) لە نموونەی یەكەمدا پاڵدراوە بەلای مرۆڤدا و شوێن و جێگای خۆیەتی بەڵام لە ئایەتەكەدا (دەست) ئاماژەیە بەدەستی پیرۆزی خوا (ﷻ)، هیچ كەسێكی ژیر و فیترەت پاكیش باوەڕی وانییە كە دەستی پەروەردگار وەك دەستی ئینسان وایە یان بەپێچەوانەوە!

یا كاتێك دەڵێیت: (ما عندك الاّ زید). واتە: كەس لای تۆ نییە جگە لە زەید، لەگەڵ (وما زید الاّ عندك). واتە: زەید لای تۆ نەبێ لە هیچ شوێنێك نییە. سەیر دەكەین ڕستەی دووەم مانایەكی جیاتری لە ڕستەی یەكەم هەیە! لەگەڵ ئەوەشدا ووشەكانیان هەر یەكن، كەواتە جیاوازی لە پێك هێنانی ڕستەدا ماناكان دەگۆڕن.

كەوا بوو زاهیری دەقەكانی سیفات چ مانایەكی ڕاستەوخۆگەیاندە مێشكی ئینسان ئەوە جێگای قەبوڵ و ئیعتیبارە..

ئەوانەی قسە و باسیان لەم بابەتە كردووە بوونەتە سێ تاقم:

یەكەم:

ئەوانەن قەبوڵی مانای زاهیری دەقەكانی سیفات دەكەن كە لایەق بێت بەخوای گەورە وە ، ئەمانەش كۆمەڵی سەلەفی صالحن كە لەسەر ڕێ ڕچەی پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵانی كۆبووتەوەو لەقەبی (أهل السنة و الجماعة) دابڕاوە بەسەر ئەماندا و یەكدەنگن لەسەر ئەم ڕاو بۆ چوونە لەسەر ئایەتەكانی سیفات هەر وەك لە زانای بەناوبانگەوە (ابن عبد البر) نقل كراوە كە دەڵێ: (ئەهلی سوونەت هەموویان یەكدەنگن لەسەر دان پێداهێنانی ئایەتەكانی سیفات كە لە قورئان و سوونەتدا هاتوون و باوەڕی تەواویان پێی هەیە و ماناكانی لەسەر (حەقیقەت) وەردەگرن كەزاهیری ووشە كە دەیبەخشێ نەك (مجاز)و لادانی بۆ مانایەكیتر بەڵام ئەمان (چۆنێتی – كیفیة–)ی سیفاتەكە دیاری ناكەن..

هەروەها زانا و قازیی بەناوبانگ (أبو یعلی) لە كتێبی (أبطال التأویل)دا دەڵێت (بەهیچ شێوەیەك دروست نی یە دەقەكانی سیفات كە لەقورئان و سوننەت دا هاتوون ڕەت بكرێنەوە یا سەرقاڵ بین بە(تأویل)و لادانی ماناكانیان بۆ ماناو مەبەستی تر، ئەوەی واجبی ئێمەیە تێگەیشتنمانە لە زاهیری دەقەكان و بزانین كە سیفاتی خوای گەورەن و ناشوبهێن بە سیفاتی مەخلوقاتەكان و ئەوەی لە ئیمامی ئەحمەد و زانایانەوە هاتووە ڕاستو دروستە..

هەر بۆیە ئەم مەزهەبەش بە ڕاست و دروست دەزانین لە دوو ڕووەوە:

١– لەبەرئەوەی ئەم مەزهەبە شوێن كەوتنی تەواوی قورئان و سوننەت نیشان دەدات لە تێگەیشتنمان بۆ سیفات و ناوە پیرۆزەكانی خوا (ﷻ) هەركەسیش بە شارەزایی و وئینصافەوە سەیری ئەم مەزهەبە بكات ئەو ڕاستیەی بۆ دەردەكەوێ.

٢– گومان لەوەدا نی یە هەق و ڕاستی یان لەوەدایە كەسەلەفی صالح ووتویانە یان لەڕاوبۆچونی غەیری ئەواندایە، گومانیش نی یە لەوەدا كەڕاو بۆچونی غەیری سەلەف حەق نی یە.. چونكە گەر وانەبێ دەبێ بوترێ مەزهەبی سەلەف لەصەحابەو تابیعین لەخۆیانەوەو بە بەتاڵ قسەیان كردووە، شتی واش لە حەقی سەلەف دا نەگونجاوە، چونكە گەر بوترێ عالم و شارەزا نەبوون لە هەق، یان شارەزا بوون بەڵام شاردویانەتەوەو نەیان وتوە، هەرچۆنێ بێ ئەم

ڕاو بۆچونانە بیّ بناغە و بەڵگەو بەتاڵن و جیلی سەلەف شارەزاترین کەس بوون بۆ ناسینی خوا و شەریعەتەکەی و ڕادەی پابەند بوونیشیان ئەوەندە ئازایەتی و حەق بێژی بـۆ دروست کـردون کەچی بەڕاست بزانن وەك ئەرکی دینی بیڵێنو بانگەشەشـی بـۆ بکـەن، کەواتـە تەنـها مەزهـەبی سەلەفی صالّح ڕاست و دروستە.

دووەم:

ئەو تاقمەن کە مانای زاهیری دەقەکان وەردەگرن بەشێوەیەك کە لایەق نـەبێت بەگـەورەیی خواوە(ﷻ ) ئەویش بە(تشـبیه) کـردن و هاوشـێوە دانـانی سـیفاتەکانی خـوا (ﷻ ) بەسـیفاتی مەخلوقەکانی ئەمەش مەزهەبێکی بەتالّ و حەرامە لە چەند ڕوویەکەوە:

١-ئـەم مەزهەبـە جینایـەت و سنور بەزاندنـە بەرانبـەر دەقـە شـەرعیەکان دەکـریّ و پـەك خسـتنی (تعطیـل)ی تـەواوە لەمەبەسـتی دەقـەکان، چـۆن دەکـریّ و دەگونجـیّ مەبەسـت پێـی (تشبیه) بێت؟! لەکاتێکدا خوا (ﷻ ) دەفەرمووێ (لیس کمثله شیء) الشوری واتە هیـچ شـتێك نییە لەوێنەی ئەو زاتە موبارەکە..

٢-عەقڵی مرۆڤەکان ئەوە دەسەلمێنیّکە (خـالق)لـە (زات و سـیفاتەکانیدا) زۆر جیـاوازە لـە (مـەخلوق) کەواتــە چــۆن دەقــە شــەرعیەکان دەگونجــیّ بکرێنــە بەڵگــە بــۆ (تشــابه) و هاوشێوەیەتی؟!

٣-ئـەم تێگەیشتنـەی ئـەهلی (تەشـبیه)بـۆ دەقـەکانی سـیفات،زۆر جیـاواز و دوورە لــە تێگەیشتنی سەلەفی صالّح. بۆیە مەزهەبێکی بەتاڵو حەرامە.جا ئەگەر ئەهلی (تەشبیه) بڵێـن: ئێمە تیّ ناگەین، دابەزینی خوای گەورە بۆ ئاسمانی دونیا یا دەستی خوا (ﷻ ) چییەو چۆنـە؟ مەگەر بڵێین وەك شێوەی مەخلوقاتە چونکە دەبیّ ئێمە لە ووتـە و گوفتـاری خـوای گـەورە تـیّ بگەین و عەقڵمان بیبڕیّ. وەڵامیشمان بۆ ئەم ڕاو مەزهەبە لە سیّ ڕووەوەیە:

١-ئەو زاتەی کە (الله)یەو بەرنامەی بۆ ناردووین دەربارەی خـودی خـۆی دەفـەرمویّ (لیس کمثله شیء) وە نەهی کردووە لەبەندەکانی کە نموونە بهێننەوە بۆ خوا (ﷻ ) یـان هاوشـێوەی بۆ بڕیار بدەن. ئەوەتا لە سورەتی (النحل) ئایەتی (٧٤)دا ئەفەرمویّ (فلا تضربوا لله الامثـال ان الله یعلم وانتم لاتعلمون) واتە: کەوابوو ئێوە ئەی خوا نەناسـەکان نموونـە مەهێننـەوە بـۆ خـواو

بەراوردی هەڵە مەكەن، چونكە خوا خۆی هەموو شتێك چاك دەزانێت بەڵام ئێوە نەزان و نەفامن.

وە لە سورەتی (البقره) ئایەتی (٢٢)دا ئەفەرموێ ( فلا تجعلوا لله انداداً وانتم تعلمون). واتە: (كەواتە شەریكو هاوتا بۆ خوا بڕیار مەدەن كەخۆشتان دەزانن پەرستراو دەبێت بەدیهێنەر بێت)، فەرمودەكانی خوا (ﷻ ) هەمووی راستن و رونكەرەوە و تاواوكەری یەكترن و هیچ فەرموودەیەك دژی ئەوی تر نی‌یە..

٢-دەڵێین بە ئەهلی (تەشبیە) ئایا باوەڕت وایەو عەقڵت دەیبڕێ كە زاتی خوا (ﷻ ) هاوشێوەی هیچ زاتێك نی‌یە؟! لە وەڵامدا دەڵێ : بەڵێ ! ئێمەش دەڵێین : كەواتە با عەقڵیشت بیبڕێ كە خوای گەورە كۆمەڵێك سیفاتی هەیە ناشوبهێ بەسیفاتی هیچ كەسێك و قسەكردن لەسەر (سیفات) وەك قسەكردنە لەسەر (زات)و هەركەس و تاقمێك جیاوازی بكات لەنێوانیاندا ئەوە تووشی (تناقض) هەڵوەشاندنەوە و دژایەتی خودی بەڵگەكانی بۆ یەكتربۆتەوە.

٣-بوترێت بەئەهلی (تەشبیە) ئایا لە نێو مەخلوقات دا نابینی هەندێك هەیە لە ناوەكانیاندا چون یەكن بەڵام لەڕاستی و چۆنێتی دا جیاوازن؟ دیارە لە وەڵامدا دەڵێ: بەڵێ! جا ئەگەر بۆ مەخلوقات عەقڵیان ئەوە ببڕێت ئەدی لە نێوان خالق و مەخلوقدا بۆ چ عەقڵیان نایبڕێ كە بڵێین خوای گەورە دەستی هەیە و ئینسانیش دەستی هەیە و هەر دووكیان لە سیفەتی (دەست بووندا)چون یەكن بەڵام لە چۆنێتی‌دا بی‌گومان (دەستەكان) جیاوازن و چۆنێتی دەستی خودا (ﷻ ) لەقورئانو سونەتدا بۆ ئێمە باس نەكراوەو ئیمانمان پی‌ی هەیە.

جیاوازیش لە نێوان (خالق و مەخلوقدا) زۆر گەورەیە ، بەڵكو موستەحیلە قیاس بكرێ هەر وەك لە بنەمای شەشەم لە بنەماكانی سیفاتدا باسمان كرد.

سێهەم:

تاقمی سێهەم ئەوانەن كە نەفی مانای زاهیر و ڕاستەوخۆی دەقەكانی سیفات دەكەن و گوایە ئەو مانای زاهیر و ڕاستەوخۆیە بەتاڵەو سەر دەكێشێ بۆ (تشبیە) كەلایەق نی‌یە بە پەروەردگارەوە ، جا بەحسابی خۆیان بۆ ئەوەی لەم گومانە دەرچن پەنایان بردووە بۆ (تعطیل) واتە لە(كار خستن)یانی لەكار خستنی ماناو مەبەستی زاهیری سیفاتەكان، جا ئیتر لە

کار خستنی گشـتی بێت بۆ (نـاوە جوانـەکانی پـەروەردگارو سیفاتەکان هـەموویان) یا لـەکار خستنی هـەندێك لـەناوو سیفاتەکان یـان یـەکێکیان.. ئـەم تاقمـە مانـا و مەبەسـتی زاهـیری دەقەکانیان لا داوە بۆ مانا و مەبەستێك کە بە عـەقڵی خۆیـان دیاریـان کـردووە ئەمەشیان نـاو ناوە (تأويل) واتە شەرح و لێکدانەوە بەنزیك ترین مانا ، بـەڵام لەڕاستیدا (تـأويل) نـی‌یـە بـەڵکو (تحريف)یانی لادانی لە مانای ڕاست و دروست بۆ مانا و مەبەستی لابەلا، ئەم مەزهەبەش بەتاڵە لە چەند ڕوویەکەوە:

١-ئەمە جینایەتێکە دژ بە دەقە شەرعیەکان ئەنجام دەدرێن و بەکار دەهێنرێن بۆ مانایەکی بەتاڵ کە نەلایەقە بە خوای گەورە وە نە ئەوەیشی مەبەستە.

٢-ئەمـە لادانـی فەرمایشـتەکانی خـواو پێغەمبەرەکەیـەتی (ﷺ) لـەمانای زاهـیرو ڕوونـی دەقەکان (النصوص)، خوای گەورە بەرنامەی خۆی بە زمانی عەرەبی ڕوون و پاراو ناردووە تـا چاك خەڵکی لێی حاڵی ببن و مانا و مەبەستە ڕاستیەکانی وەك خۆی وەربگرن ، ئـەوەندە هەیـە لە (تكيف و تمثيل) کە لایەق نین بە پەروەردگارەوە خۆیان بە دووربگرن .

٣-لادانی فەرمودەی خوا (ﷻ) و پێغەمبەر (ﷺ) لەمانای زاهیری بۆ مانایەك کە پێچەوانەی بێت ، قسـە و بڕیارێکـە بـەدەم خـواوە هەڵدەبەسـترێو ئەمـەش حەرامـە، ئـەوەتا لـە سـورەتی (الأعراف) ئایەتی (٣٣) دا دەفەرموێ ﴿ قل إنما حرّم ربي الفواحش ما ظهر منها وما بطن و الإثم و البغي بغير الحق و أن تشركوا بالله ما لم ينزل به سلطانا و أن تقولوا علـى الله مـا لا تعلمـون ﴾ واتە: پێیان بڵێ بەڕاسـتی پـەروەردگارم هـەرچی گونـاهو خراپەیـە حـەرامی کـردووە چ ئەوانـەی ئاشـکران چ ئەوانـەی پەنـهانن ، هـەروەها هـەموو گونـاه و دەسـت درێژیـەکی بەناحـەق حـەرام کردووە ، شـتێك بکـەن بەشـەریك و هـاوەڵ بۆ خـوا، کە هیـچ دەسـەڵاتی پێنـەداوە، هـەروەها حەرامی کردووە لە خۆتانەوە بەناوی خواوە دوور لە زانیاری و زانست شت بڵێن).

هەروەها لە سورەتی (الأسراء) ئایەتی (٣٦)دا ئەفەرموێ ﴿ ولا تَقفُ مـا ليس لك بـه علم إن السمع والبصير و الفؤاد كل أولئك كـان عنـه مسـؤولاً ﴾. واتـە: ئـەی ئینسـان لـە شـتێك مەدوێ و شوێن شتێك مەکەوە کـە زانسـت و زانیاریت دەربارەی نی‌یـە ، چونکـە بـە ڕاسـتی دەزگاکانی بیسـتن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بـەر پرسیارە لـە بەرامبەریـەوە جا ئـەو

كەسەی كە فەرموودەكانی خوا (ﷻ ) و پێغەمبەر (ﷺ) لە مانای زاهیری خۆی لادەدا بۆ مانایەك كە پێچەوانەیە ، بەڕاستی ئەوە بە پێچەوانەی ئایەتی سەرەوە ﴿ولا تقف ما ليس لـك بـه علـم﴾ كاری كردووە ، هەروەها ئایەتی پێشتر كە فەرمووی ﴿ وأن تقولوا على الله ما لا تعلمون﴾ پشت گوێ خستووە پەنا بەخوا!

چونكە دیاری كردنی مانایەكی‌تر جگە لە مانای زاهیری ، جیا لەوەی قسە كردنە بەدەم خوا و پێغەمبەرەوە فەزڵ دانی مانایەكی نەخوازراوو لادراویشە بەسەر مانایەكی ڕوون و ئاشكرادا بـە بەڵگەی گومان و وەهم و خەیاڵ !!!

هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (ص) ئایەتی (٥٧)دا دەفـەرموێ ﴿ مـا منعـك أن تسـجد لما خلقت بيديّ﴾ واتە : ئەی ئیبلیس –شەیتان– ئەوە چی‌یە بەرگری لـە تـۆ دەكات كڕنووش بەریت بۆ ئەو كەسەی كە بە هەردوو دەستی خۆم دروستم كردووە.

جا ئەگەر بێتوو مانای (بيديّ) لە ئایەتەكەدا لە زاهیری خۆی لابدرێت وە بوترێـت :مەبەسـت بە (يديَّ) دەستی ڕاستەقینە نی‌یە بەڵكو مەبەست شتی ترە! ئێمە دەڵێین : بەڵگەتان چی‌یە بۆ ڕەدكردنەوەی مانای ڕاستەقینەی (يديَّ) ؟! بێگومان هیچ بەڵگەیەك نی‌یە ، بۆیە مانـای (يـديّ) سەلماندنی (دەستی حەقیقی یە) بۆ پەروەردگار.

٤–بـەتاڵ كردنـەوەی مەزهـەبی (ئـەهلی تعطيـل) بـەوەی كـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەگـەڵ هاوەڵەكانیان و شوێن كەوتوانیان و سەلەف هـەرگیز مانـای ئایەتـەكانی سیفاتیان لـە زاهـیری خۆی لانەداوە بۆ مانایەكی تر..

٥– پرسیار بكرێ لە ئەهلی (تعطيل): ئایا خوای گەورە لە هەموو كەس باشتر خۆی ناناسێ و ئاگادار نی‌یە بە ناوو سیفاتەكانی تا كەسێكی تر؟؟ بێگومان دەڵێن: بەڵێ، پاشتر دەڵێین: ئایا ئەوەی خوای گەورە دەربارەی خۆی فەرمویەتی حەق و ڕاست نی‌یە لـە وەڵامـدا دەڵێـن: بـەڵێ، دواتر دەڵێین ، ئایا ووتە و قسەیەك شك دەبەن لە ووتـەو قسـەی پـەروەردگار ڕوونـتر و فەسـیح تر؟ بێگومان دەڵێن: نەخێر پاشتر دەڵێـین: ئایـا گومـان دەبـەن خـوای گـەورە بیـەوێت خـەڵك چەواشە بكات و ڕاستیان لێ بشارێتەوە تا ناچار ببن بە عەقڵی خۆیان بۆی بگەڕێن؟؟ لە وەڵامدا دەڵێن: نەخێر

ئەم پرسیارانە سەبارەت بە فەرمودەکانی خوا (ﷻ) لە قورئاندا، سەبارەت بەوەش کـە لـە سوننەتەکانی پێغەمبـەریش هـاتووە لـەم بارەیـەوە دیسـانەوە پرسـیار لـە کەسـانی سـەر بـە مەزهەبی (تعطیل) دەکەین و دەڵێین ؟ ئایا تۆ لە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) شـارەزاتری دەربـارەی ناسینی خـوا؟ بێگومـان دەڵـێ نـەخێر؛ ئێمـەش دەڵێـین: ئایـا ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی حەق‌و ڕاستە؟ لەوەڵامدا دەڵێ: بـەڵێ، پاشـان دەڵـێن: کـەس هەیـە لەپێغەمبـەری خوا بەلیغ‌و فەسیحتر؟ دڵسۆزتر لەپێغەمبـەر بـۆ عـەبدەکانی خـوا؟ گومانمـان نـیـە کـە دەڵـێ: نەخێر مادەم وابێ ئێمە دەڵێین پێیان:- جـا کـە ئێـوە ئیقـرار بـەو ڕاسـتیانەی سـەرەوە بکـەن کەواتـە بۆچـی هێنـدە ئـازاو خـاوەن بڕیـارِ نـین لـەوەی کـە بوێرانـە بڵێـن : خـوای گـەورە و پێغەمبەر(ﷺ) چییان سەلماندووە لە نـاوو سـیفات لـە قورئـاندا هـاتووە ئێمـەیش دەیسـەلمێنین لەسەر مانای حەقیقی و زاهیری کە لایەق بێت بە خواوە.

ئایا ئەمە باشتر و بەهێزتر نی‌یە بۆ ئێوەکە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارتان لێدەکرێ هـەر وەك لە سورەتی (القصص) ئایەتی (٦٥)دا ئەفەرموێ ﴿ ماذا أجبتم المرسلين ﴾. واتە: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟! باشە لادان لە مانای زاهیری دەقەکان بۆ مانایەکی نەخوازراوی‌تر هەنگاوێکی ترسناك و پڕ مەترسی نی‌یە؟!

٦- لەهەڵوەشاندنەوەی مەزهەبی ئەهلی (تعطیل)دا ، کۆمەڵێك دەرئەنجام دێنە پێشەوە کە هەموویان بێ ئەساس و بەتاڵن، شتێکیش کە دەرئەنجامەکەی بەتاڵ بێت بەڵگە و بیناغەکەیشی هەر بەتاڵە: لەو دەرەنجامانەش:

یەکەم:

ئـەهلی (تعطیـل) کـاتێ (بەخـەیاڵی خۆیـان!) ناچـار بـوون کـە لــە مانــای زاهـیری دەقــە شەرعیەکان لابدەن لەبەر خاتری ئەوە بوو گوایە گەر زاهیری دەقەکان لێك بدەینەوە (تشبيه) و شوبهاندنی خوا (ﷻ) بـە مخلوقاتـەوە دروسـت دەبێـت کـاتێ(دەسـت ، یـان هـاتن و دابـەزینی پەروەردگار بۆ ئاسمانی یەکەم ) بسەلمێنن ئەمەش (بەحسابی ئەوان)!کوفرە و بۆ ئەوەی یەکتا پەرستی خودا بسەلمێنن (بەخەیاڵی خۆیـان)!هـاتن ئایەتـەکانی سیفاتیان (تعطیـل)کرد وتیـان دەبێ لەمانای زاهیر خۆمان لابدەین!!! ئەوەتا خوای گەورەش دەفەرموێ (ليس كمثلـه شـيء)

جا لەبەر ئەوەی بناغەی مەزهەبەکەیان بەتاڵ بوو بۆیە دەرئەنجامەکەیشی هەر بەتاڵ دەبێت و ئەوەتا یەکێك لەشێخە پایەبەرزەکانی ئیمامی بوخاری بەناوی (نعیم بن حماد الخزاعی) ئەفەرموێ (من شبه الله بخلقه فقد كفر من جحد ما وصف الله به نفسه فقد كفر وليس ما وصف الله به نفسه ولا رسوله تشبيهاً). واتە: هەرکەسێك خوای گەورە بچوێنێت و بشوبهێنێ بەدروست کراوەکانیەوە ئەوە کافر بووە ، وە هەرکەسێ ئینکار و بێ بڕوا بێت بەو وەسفانەی کە خوای گەورە خۆیی پێ وەسف کردوون ئەوەش هەر کافر دەبێت ئەوەش کە خوای گەورە وەسفی خۆیی پێ کردووە یا پێغەمبەرەکەی باسی کردووە لەسیفاتەکان هیچیان چواندن و (تشبيه) نین. گومانیش لەوەدا نی یە کە بەتاڵ ترین (باطل)ئەوەیە کە زاهیری فەرموودەی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بە (تشبيه)، یا کوفر، یا ئاماژە بۆ کوفر حیساب بکرێ !

دووەم:

گەر بەقسەی ئەهلی (تعطيل) بێت کە باسی (ناوە جوانەکان و سیفاتەکانی پەروەردگار) بەجێ بهێڵرێ بۆ (عەقڵ) قسەی تێدا بکات بەوەی چی بسەلمێنێ و چیش ڕەد بکاتەوە بیکات. دەبێ ئەو کاتە بوترێ ئەو قورئانەی کەخوای گەورە وەصفی کردوە بە (تبياناً لكل شيْ) و(هدى للناس) و(شفاءً لما في الصدور) و (نوراً اميناً) و (فرقانا بين الحق و الباطل) لەگەڵ ئەم وەسفە جوان و فراوانانەدا باسی ئەوەی نەکردووە کە عەقیدەی ئینسانی موسوڵمان چۆن بێت دەربارەی (ناو و سیفەتەکانی) پەروەردگار کەگرنگترین بابەتی ئیمانە !! ئایا قسەی وا قەبوڵە و کەس دەتوانێ وابڵێت؟!!

٣-ئەگەر بەقسە و مەزهەبی (أصل التعطيل) بێت دەبێ بڵێین : پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خەلیفە راشیدینەکان و هاوەڵان و سەلەف و پێشەوایانی ئەم ئوممەتە هەموویان یا نەیانتوانیوە تێ بگەن لە (ناو و سیفاتەکانی پەروەردگار) و ڕونکردنەوەی ئەوەی واجبە لەسەر ئینسان لەحەقی خوای گەورەدا وە ئەوەی کە دروست نی یە یا جائیزە .. یا پشت گوێ خەر وبێ موبالات بوون سەبارەت بەگەیاندنی مانا و مەبەستی (ناو و سیفاتەکان) ... کە گومان بردن بۆ هەریەك لەو دوو حاڵەتە نەك هەر بێڕێزی و نەفامی دەگەیەنێ بەڵکو سەر لە بێ باوەڕیشەوە

دەردەكات! ! ! بەڵكوتەنها یەك حەرفیش لەپێغەمبەرو (ﷺ) جیلی سەلەفەوە نەهاتووە بۆ ئێمـە كە پشتگیری ( اهل التعطیل) بكات و ناچاربین (تأویل) بكەین.

٤-یەكێكی تر لەدەرئەنجامەكانی رای ئەهلی (تعطیل) ئەوەیە كە فـەرمودەكانی خـوا (ﷻ ) وە پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوە و (مەرجەع) نین بۆ خەڵك لە بیروباوەڕیـاندا سـەبارەت بـە ناسـینی (نـاوو سـیفاتەكانی) پـەروەردگار، كـە یەكـەمین پایـەی ئیمانـەو كاكڵـە و پوختـەی شـەریعەتە ئاسمانیـەكان لـە ڕێـك و جـوان ناسـینی (نـاوو سـیفاتەكانی) پـەروەردگاردا كۆدەبێتـەوە بـەڵكو سەرچاوە و(مەرجەع) بەلای ئەوانەوە تەنها (عەقڵە) ..

بۆیە گەر ئیمانیان بە دەقە شەرعیەكان هەبوو لەم بابەتەدا بەڵام نـەدەچوو بـە عـەقڵیاندا ! ناچار پەنایان دەبرد بۆ (تأویل) كردنی ، هەرچەندە لە ڕاستیدا (تحریف)و لادانە و بەڵام بەناوی (تأویل)ەوە ! !

٥- دەرئەنجامێكی تری ترسناك لە ڕای ئەهلی (تعطیل) ئەمەیە كە نـەفی سیفاتێك دەكـەن كە خوای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ) سەلماندویانە بۆ خوای گەورە ، بۆ نمونە لە سورەتی (الفجر) ئایەتی (٢٢)دا دەفەرموێ ﴿ وجاء ربك ﴾ واتە: پەروەردگارت دێت.

هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێ (یـنزل ربنـا الی السـماء الدنیـا) واتـە پـەروەردگارمان دادەبـەزێ بـۆ ئاسمـانی دونیـا ، جـا بـەلای ئەوانـەوە (هـاتنی پـەروەردگارو دابـەزینی) نـیـە و نابێت! ! بۆیە مانای زاهیری ئایەت و فەرمودەكە (جاء.... ویـنزل) لـە مانـای (حـەقیقی یـەوە) دەگۆڕن بۆ مانای (مجاز) ، دیـارترین نیشـانەكانی (مجـاز)یـش لای ئـەوان ئەوەیـە كـە دروسـتە (نەفی) ماناكەی بكەیت ! جا ڕەت كردنەوە و نەفی كردنی سیفەتێك كە خوای گەورە بە ڕوون و حەقیقی بۆ خۆی سەلماندویەتیلە بەتاڵ ترین (باطل) ە وە ناشـگونجێ (تـأویل) بكـرێ چونكـە سیاقی ڕستەو ئایەتەكە هەڵیناگرێ.

جێگـای بـاس و ئامـاژە پێكردنـە كـە هـەندێ لـە (أهـل التعطیـل)لـە سنوری بـاس كردنـی سیفاتەكانی خودا (ﷻ ) نەوەستاون بـەڵكو تێیـان پـەڕاندووە بـۆ باسـی (نـاوە پیرۆزەكـانیش) هەندێكی تریشیان توشی (تناقض) واتە: بەگژاچوونـەوەی مەزهـەب و بنـەماكانی خۆیـان بـوون بەوەی هەندێك لە سیفاتەكان دەسەلمێنن و هەندێكی تر (تأویل) دەكەن ؟!

وەك كۆمەڵی (الأشعرية والماتريدية) كە هەندێ سیفەت دەسەلمێنن لەبەر ئەوەی كە (عەقڵ) دەیسەلمێنێ و جێگیری دەكات ، وە هەندێك سیفاتیتر نەفی دەكەن بە بیانووی ئەوەی كە گوایە عەقڵ نەفی دەكات یا ناتوانێ بەڵگەی بۆ بهێنێتەوە...

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین: نەفی كرفتان بۆ ئەو سیفاتانەی كە ئەتان سەلماندوە بە بەڵگەی ئەوەی كە عەقڵ نایسەلمێنێ ؛ دەتوانرێ بسەلمێنرێ بەو ڕێگا عەقڵییەی كە ئێوە هەندێ سیفاتتان پێ سەلماندوە هەر وەك چۆن بەڵگەی قورئان و سوننەتیشی لەسەر هاتووە و سەلماندویەتی.

بۆ نموونە: ئەوان سیفاتی (الأرادة ، ویستن)یان سەلماندووە بەڵام سیفەتی (الرحمة)یان نەفی كردووە.. سیفاتی (الأرادة)یان بە بەڵگەی عەقڵ و قورئان سەلماندووە..

بەڵگەی قورئان:

لە سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٥٣)دا ئەفەرموێ ﴿ ولكن الله يفعل ما يريد ﴾. واتە: بەڵام خوای گەورە چی بوێت ئەوە ئەنجام دەدات.

بەڵگەی عەقڵ:

جیاوازی مەخلوقات و تایبەتمەندێتی هەندێكیان لە (زات و وەصف)دا لە هەندێكیتر بەڵگەی ئیرادە و ویستی خوایە (ﷻ) بەڵام!

سیفاتی (الرحمة) واتە (بەزەیی) نەفیان كردووە لە خوای گەورە بە بەڵگەی ئەوەی كە گوایە! (ڕەحمەت و بەزەیی) نەرم و نیانی خاوەنەكەی دەخوازێت و زۆر نەرمیش لەگەڵ مەخلوقاتدا ، ئەمەش دروست نییە و مەحاڵە لە حەقی خوادا بگونجێ!

هەر بۆیەش ئەو بەڵگانەی لە قورئان و سونەتدا هاتوون كە سیفاتی (ڕەحمەت و بەزەیی) پەروەردگار دەسەلمێنن ئەمان لەبەر مەزهەبەكەی خۆیان هاتوون (تأويل)یان كردووە و دەڵێن: ڕەحمەت مەبەست پێی ﴿ الفعل أو أرادة الفعل ﴾. واتە:كردەوەی بەبەزەییانە بۆیە تەفسیری

ناوی پیرۆزی (الرحیم) دەکـەن بـە ﴿ المنعم أو مرید الأنعام ﴾؟ واتـە: خـاوەن نیعمـەت و یـا دەیەوێت خۆشی و نیعمەت برژێنێ بەسەر عەبدەکانیدا!

ئێمەش لە وەلامیاندا دەلێین:

سیفەتی (الرحمة) بەبەلگەی قورئان و سونەت سەلمێنراوە و ژمارە و جۆری بەلگەکانی زۆر زیـاترن لـە بەلگـەکانی سـیفەتی (الأرادة) کـە چـی ئێـوە ڕەحمـەت و ئـیرادەت لـە یـەك جیادەکەنەوە!!

ئەوەتا سیفاتی (الرحمة یا الرحیم) لە زۆر ئایەتدا هاتووە بۆ نموونـە لـە سورەتی (الفاتحة) ئایەتی (۳)دا دەفەرموێ ﴿الرحمن الرحیم﴾ وەك ناوی پیرۆزی (الرحیم) هاتووە.

وە لـە سورەتی (الکهف) ئایـەتی (۵۸) دا ئەفـەرموێ (و ربـك الغفـور ذو الرحمـة) واتـە: پەروەدگاری تۆ لێخۆشبووە و خاوەنی سیفەتی ڕەحمەت و میهرەبانیە .. لـێرەدا وەك سیفەتی (الرحمة) هاتووە بەلام لە سورەتی (العنکبوت) ئایەتی (۲۱) دا ئەفەموێ ﴿ ویرحم من یشاء﴾ واتە: سۆز و میـهرەبانی خـۆی دەنوێنـێ بـۆ ئەوانـەی کـە دەیـەوێت و بـاوەڕدارن .. لێرەدا بـە شێوەی کردار و فیعل (ویرحم) ئەم سیفەتەی بـاس کـردووە بەلگـەی عـەقلیش بـۆ سـەلماندنی سیفەتی (ڕەحمەت) زۆر ڕوون و دیارە ، ئەو هەموو نـاز و نیعمەتـەی کـە بەسـەر بەندەکانیـەوە دەبینـرێ لەگـەڵ ئـەو هـەموو ناخۆشـی و بەلایانـەی کـە پـەروەردگار لای داوە لەسـەریان و پاراستونی لێی.

کەواتـە (نـەفی) سیفەتی (ڕەحمـەت) بـە گومـانی ئـەوەی (نـەرمی و شـلی) دەخوازێـت وەلامەکەی جگە لەوەی سەرەوە . دەلێین : گەر وابێت ئێوە دەلێن دەبـێ سـیفەتی (الأرادة)ش نەفی بکرێ چونکە (الأرادة)یانی : (میل المرید الی ما یرجوبه حصول منفعة أو دفع مضرة) واتە: خاوەن ویست بە سیفەتی (ویستن) دەیـەوێ سـوود و قـازانجێ بـۆ خـۆی ڕابکێشـێ یـا زەرەر و زیانێك لە خۆی لابدات ئەمەش (حاجة) و پێویستی دەگەیەنێ ، خوای گەورەش لەوە بـەهێزتر و پاکترە پێویستی بە هیچ مەخلوقاتێك هەبێت :- جا ئەگەر ئەهلی (التعطیل) وەلاممان بدەنـەوە و بلێن ئەو پێناسەی سەرەوە بۆ (الأرادة) کە (میل المرید الی ما یرجو به حصول منفعـة أو دفـع مضرە..) بۆ مەخلوقاتە و زاتی خوادا (ﷻ) نابێ باسی لێوە بکرێ ئێمەش دەلێـین : دەی ئـەو

سیفەتی (الرحمة)یەش کە ئێوە دەڵێن (نەرمی و شلی) دەخوازێت ئەوە بۆ مەخلوقاتە و بۆ پەروەردگار وەها نی‌یە..

بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە مەزهەبی ئەهلی (التعطیل) بەتاڵە و هیچ بناغەیەکی شەرعی نی‌یە ! هەر لێرەوە بۆشمان دەردەکەوێ کە مەزهەب و ڕێگای الأشاعرة [3] والماتریدیة[4] سەبارەت بە (ناوە جوانەکانی خواو سیفاتەکانی) قسە و گومانەکانی (المعتزلة [5] و الجهمیة [6]) هەڵناوەشێنێتەوە لە دوو ڕووەوە:

---

٣- الأشاعرة:- کۆمەڵێکی شوێن کەوتوی ( أبو الحسن الأشعری) ین لە عەقیدەدا و لە (١٥) بابەتدا جیاوازیان لە مەزهەبی (اهل السنة و الجماعة) دا هەیە بە تایبەت بابەتی (الأسماء و الصفات) مەزهەبەکەیان تێکەڵاو و پێکهاتووە لە وەحی (قورئان و سوننەت) لەگەڵ (فەلسەفە) بۆیە لە کاتی (تعارض) جیایی و دژایەتی لەنێوان بەڵگەکانی (عەقڵ و نەقڵ کە قورئان و سوننەتە)، بەڵگەی (عەقل)پێش دەخەن بەسەر نەقڵدا بۆیە دەبینین ئایەتەکانی سیفاتی خوا (ﷻ) (تأویل) دەکەن بۆ مانایەك لەگەڵ عەقڵدا بگونجێ ؟؟ هەرچەندە( أبو الحسن الأشعری) لە کۆتایی ژیانیدا پەشیمان بۆتەوە لەم مەزهەبە و چۆتە سەر مەزهەبی (أهل السنة و الجماعة).

٤- الماتریدي:- کۆمەڵێکن شوێن کەوتوی (أبو منصور الماتریدی)ین ، بە لایانەوە سەرچاوەی یەکەمی دین و عەقیدە وەرگرتن عەقڵە پاشان نەقڵ بەڵام ئەو دەقە شەرعیانەی باسی قیامەت و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار دەکەن لەسەر مانا زاهیریەکەی وەری دەگرن ، وە لە بابەتی (ناوە جوانەکان و سیفاتدا) لەسەر مەزهەبی ئەهلی (تأویل) و (تفویض)ن، وە تەنها (٨) سیفات دەسەلمێنن بۆ خوای گەورە کە ئەو حەوت سیفاتەن کۆمەڵی (الأشاعرية) سەلماندویانە وەك (الحیاه، العلم ، القدره ، الإرادة ، السمع ، البصر ، الكلام ) لەگەڵ زیاد کردنی سیفاتی ( التكوین) واتە (بوون و پێکهێنان) کە (الماتوریدیة) زیادیان کردووە .. هەروەها دەڵێن : ئیمان زیاد و کەم ناکات ! وە دەڵێن ( عەمەل و کردەوە جیایە لە ئیماندا) ..

٥- المعتزلة: کۆمەڵێکن بە ناوی (واصل بن عطاء) ناونراون کاتێك پرسیار کرا لە ئیمامی حەسەنی بەصرەیی دەربارەی ئەو کەسەی گوناهی کەبیرە دەکات یەکسەر (واصل) ووتی ئەوانە نەکافرن وە نەئیماندارن بەڵکو لە نێوان هەر دووکیاندان، بۆیە ئیمامی حەسەن پێی فەرموو (ئەی واصل) برۆ (إعتزال) بکە لە ئێمە واتە (جیابەرەوە) لەم مزگەوتی بەصرەیە برۆ دەرەوە.. دەربارەی (ناوە پیرۆزەکان و سیفات) ڕایان وایە نەفی هەموو سیفاتەکان دەکەن و تەنها (ناوەکان) جێگیر ودەسەلمێنن ، گوایە بە خەیاڵی خۆیان گەر سیفاتەکان بسەلمێنن ئەوە توشی (تجسیم) واتە : جیسم و قەبارە بۆ خوا بڕیاردان دەبن جا بۆ ئەوەی خۆیان لە شوبهاندنی خوا بە مەخلوقات و (تجسیم) بپارێزن بڕیاری نەفی کردنی سیفاتەکانیان داوە ! !

٦- الجهمیة: کۆمەڵێك بوون بە ناوی (جهم بن صفوان) خەڵکی(سمرقند) بوە لەسەر ڕچە و ڕێبازی (جعد بن درهم) بووە ، کە والی عێراق لە جەژنی قوربانیدا سەری بڕی چونکە دەی ووت: (ان الله لم یتخذ ابراهیم خلیلا ولم یکلم موسی تکلیماً)

١-ڕێگای فەلسـەفە و عـەقڵی ڕووت بۆ سـەلماندنی (نـاوە جوانـەکان و سـیفات) ڕێگایـەکی (مبتدع) داهێنراوە و پێغەمبەری خـوا (ﷺ) و هـاوەڵانی و جیلـی سـەلەفی صـاڵح لـەم ڕێگایـەوە بەرگریان لە عەقیدە و ناوو سیفاتەکان نەکردووەو بیدعە بـە بیدعـە وەڵام نادرێتـەوە بـەڵکو بـە قورئان سونەت ڕەد دەکرێتەوە.

٢-تـاقمی (المعتزلـة و الجهميـة) دەتوانـن وەڵام و ڕەخنـەیان هـەبێت لـە (تـاقمی الأشـاعرة والماتريدية) بەوەی کـە هـەردوو تـاقمی یەکـەم و دووەم سـەرچاوەی بـیرو تێگەیشـتنیان تەنـها (عەقڵ و فەلسەفەیە) بۆیـە کـاتێ تـاقمی یەکـەم (المعتزلـة و الجهميـة)دەڵێـن بـە تـاقمی دووەم (الأشـاعرة والماتريديـة) ئێـوە هەڵـەن، تەنـها بەڵگـەیان بـۆ بـەر پـەرچ دانـەوەیان (عـەقڵ و فەلسەفەیە) بەهەمان شێوە ! ئەوجا چ گرێنتی و (ضمانة) ێك هەیە کامیـان ڕاسـت دەکـات ؟! چونکە دەکرێ هەردوولا بەیەکتر بڵێن ئێوە چۆن (عەقڵتان) هەیـە ئێمـەش هـەروەها ، جا گـەر عەقڵی ئێمە هەڵە بێت ئێوەش بە هەمان‌شێوە چونکە تاکە سـەرچاوەی هـەردوولا (فەلسـەفە و عەقڵە)!

ئەمـەش بەڵگەیـەکی بـەهێز و دەمکوت کـەرە (حجـة دامغـة)یە بـۆ ئـەوەی هـەر دوو تـاقم بێدەنگ بکـات و تەنـها ڕێگـا و تێگەشـتنێك مـابێت پـەنای بـۆ بـەرین گەڕانەوەیـە بـۆ مەزهـەبی سەلەفی صاڵح کە (دەقە شەرعیەکان لە قورئان و سوونەت) دەکەنە سـەرچاوەی یەکـەم و ئـەو (ناوە پیرۆز و سیفاتانە) دەسـەلمێنن کـە خـوای گـەورە لـە وەسـفی خۆیـدا لـە قورئـاندا باسـی کردوون یا لەسەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون کراونەتەوە بە شێوەیەك کە دووربێت لە (تمثیـل و تکییف) واتە دیاری نەکردنی هاو شێوە و چۆنێتی لەگەڵ بڕیاردانی (تنزیە) پاکی و لایەقی هـەر ناو و سیفاتێك بە خواوە (ﷻ ) کە دوور بێت لـە (تعطیـل و تحریـف) هـەر وەك پێشـتر ڕوونمـان کردەوە کە ڕاو بۆ چوونی ئەهلی (تعطیل) لە کوێوە سەرچاوەی گرتوە..

---

واتە: خوای گەورە نە ئیبراهیمی بە دۆستی خۆی داناوە وە نەقسەیشی لەگەڵ موسادا کردووە!! وە دەڵێن :ناوەکانی خوای گەورە جیاوەزن لە خوا و شتێکی‌ترن! ناوەکـانیش لـە قسەکانەوە دەرچـوون و قسەکانیش جیـاوازن لـە خـوای گەورە ، بۆیە خوا (ﷻ ) نە ناو نە سیفات نەکردار (الأفعال)ی بۆنی‌یەو تەنها بوونی هەیە و هیچی‌تر!!! پەنا بەخوا لە گومڕای ئەم تاقمە.

﴿ وەلام دانەوەی گومانێکی تر ﴾

ئەوانـەی ئـەهلی (تـأویل)ن ، گومـان و ڕەخنەیـەکیان ئاراسـتەی ئـەهلی (سـونەت و جەماعەت)کردووە سەبارەت بە (سیفاتەکانی پەروەردگار)، ئـەویش ئەمەیـە: کـە گوایـە ئـەهلی (سونەت)خۆیان (تأویل)یان کردووە و لە زاهیری هەندێ لە ماناکانی سیفات خۆیـان لاداوە ! جا دەڵێن: کەواتە بۆ ڕەخنە لە ئێمە دەگرن؟!

ئێمەش بە پشتیوانی خوا وەلامی ئەم گومان و ڕەخنەیە دەدەینەوە بە شێوەیەکی کـورت و درێژ وەلامە کورتەکەمان لە دوو خاڵدایە:

١- ئێمە ئەوە ناسەلمێنین کە شەرح و ڕاڤەی سەلەف بۆ هەندێ لە سیفاتەکان لادان بێت لە مانای زاهیری خۆیان ، چونکە زاهیری هەر ووشە و قسـەیەك ئەوەیـە کـە چ مانـا و مەبەسـتێکی لێدەفامرێتـەوە ، ئـەم مانـا و مەبەسـتەش بـەپێی (سـیاق)ی قسـە و ووشـەکان و دانـەپاڵ (ئیضافـة)یـان بـۆ هـەر شـوێن و کەسـێك دەگۆڕێـن ، هـەروەها جوملـە و ووشـەکان ماناکانیـان دەگۆڕێن بەپێی جۆری پێکهێنانی جوملەکان (ترکیب الکلام) ، دیارە قسەش لە کۆمەڵـە ووشـە و جوملەیەك پێك هاتووە چ کاتێك بدرێنە پاڵ یەکتر و کۆبکرێنەوە ئەو کاتە باشتر و چاکتر مانـا دەبەخشن.

٢-ئەگەر سەلماندیشمان ووتمان سەلەفی صالح لە ڕاڤە و تەفسیرەکانیاندا بۆ هەندێ سـیفات و هەندێ جار لایان داوە لەمانای زاهیری دەقەکان ، دەڵێین بێگومان لەحاڵەتی وەهادا بەڵگەیان لە قورئان و سـونەت هـەبووەو بەکۆکردنـەوە و پێکـەوەنانی بەڵگـەکان بێـت یـا جیاجیـا و هـەر بەڵگەی لەشوێنی خۆیدا بێت ، نەك شوبهە و گومان . بکرێتە بەڵگەی جێگیر و (قطعي) وە نـەفی دەقە شەرعیە سەلمێنراوەکان بۆ سیفاتی پەروەردگاریان پێ بکرێتەوە؟؟

بەدرێژیش دەڵێین ئەو دەقە شەرعیانەی کەکراونەتە گومان و ڕەخنە لەسـەر سـەلەفی صـالح گوایـە (تـأویل)یـان تێداکـردوون و لـەمانای زاهـیری خۆیـان لایـان داون. باهـەندێکیش نموونـە بهێنینەوە :

ئیمامی غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە هەندێ زانای سەربە مەزهەبی ئیمامی ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کـە : ئیمـامی ئەحمـەد هـەرگیز (تـأویل)ی

نەکردوە مەگەر لە سێ شوێندا نـەبێت . یەکـەم : (الحجر الاسود یمـین الله فی الارض) دووەم : (قلوب العباد بین اصبعین من أصابیع الرحمن) سێیەم: (وإنی اجد نفس الرحمن مـن قبـل الیمـن) ئەم سێ دەقە شێخی ئیسلام ئیبنولتەیمیە لـە لاپـەڕە(٣٩٨) ج ٥ لـە کتێبی (مجمـوع الفتـاوی) نقڵی کردوەو دەڵێ : ئەم ڕیوایەتە درۆ و هەڵبەستراوە لە ئیمامی ئەحمەدەوە.

نموونەی یەکەم :

(الحجـر الاسـود یمـین الله فی الارض) ، واتـە: بـەردە ڕەشـەکەی مـاڵی خـوا دەسـتی ڕاسـتی پەروەردگارە لە زەویدا..

لە وەڵامدا دەڵێین:- ئەمە حەدیسێکی (باطل)ە لە پێغەمبەری خـواوە (ﷺ) گێڕدراوەتـەوە هیچ سەرچاوەیەکی ڕاستی نی‌یە ، ئیمامی (إبـن الجـوزی) لـە کتێبی (العلـل المتناهیـە)دا دەڵێ (حدیث لا یصح) هەروەها زانای بەناوبانگ (ابن العربی) ئەڵێ (حدیث بـاطل لایلتفت إلیـە ) واتـە حەدیسێکی باتڵە و ئاوڕی لێ نادرێتەوە. هەروەها شێخی ئیسـلام ئیبنولتەیمیـەش دەڵێـت (روی عـن النـبی (ﷺ) باسـناد لایثبـت) واتـە: ئـەم قسـەیە ڕیوایـەت کـراوە لـە پێغەمبـەرەوە بـە سـەنەدێك کە ئیسـپات نـابێت) کـەواتە هیـچ پێویسـت بـە لێکۆڵینـەوە لـە ماناکـەی ناکـات مادەم قسـەیەکی بەتاڵ و بێ سـەنەدی صەحیح بێت.

بەلأم شێخو لئیسلام ئیبنولتەیمیە دەفەرموێ :ئەوەی کە بەسەنەدی (مەشهور) لەم بابەتەدا هاتووە قسەیەکی (عەبدوڵای کوڕی عەباسە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێـت) کـە دەفـەرموێ (الحجـر الاسود یمین الله فی الارض ، فمن صافحە و قبلە ، فکأنما صافح الله و قبل یمینە ) واتـە : بـەردە ڕەشەکەی ماڵی خوا (ﷻ ) دەسـتی ڕاسـتی پـەروەردگارە لەسـەر زەویـدا و هەرکـەس تەوقـەی لەگەڵ بکات یادەستی پێدا بێنێت و ماچی بکات ، وەك ئەوە وایە تەوقەی لەگەڵ پەروەردگاردا کردبێ و دەسـتی ڕاسـتی پـەروەردگاری مـاچ کردبـێ) جا هـەر کـەس وورد بێتـەوە لـە لـەفز و ووشەکانی ئەم قسەیە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە هیچ تەم و مژو (إشکال)ێکی تێدا نی‌یە ، چونکـە دەڵێ (یمین الله علی الأرض) دەستی خوا (ﷻ ) لەسەر زەویدا ، واتە دیاری کردووە (مقیـد) بـە (سەر زەوی) نەك بە گشتی و (مطلق) بڵـێ (یمـین الله) ؟ جا لـە زمـانی عـەرەبیدا (حکـم اللفـظ

المقيد يخالف الحكم المطلق) واتە حوکم و بەکارهێنانی لەفزی (مقيد) جیاوازە لە حوکمی (مطلق) و گشتی ..

پاشتر ئیمامی عەبدوڵای کوڕی عەباس ئەفەرمویٚ لە ووتەیەکەیدا (فمن صافحه و قبله فكأنما صافح الله و قبل يمينه) واتە : هەرکەسێك تەوقە یا دەست بدات لە بەردە ڕەشەکە و ماچی بکات (وەك ئەوە وایە تەوقەی لەگەڵ پەروەردگار کردبێت ..

کەواتە ووتەکەی ئیمامی عەبدوڵا ڕوون وئاشکرایە کە ئەو کەسەی تەوقە لەگەڵ بەردەکەدا دەکات مانای وانی‌یە تەوقەی لەگەڵ خوادا (ﷻ) کردبیٚ بە ڕاستی ؟ بەڵکو شوبهاندویەتی (كأنما) بەو کەسەی تەوقە لەگەڵ پەروەردگار دا دەکات ، کەواتە سەرەتا و کۆتایی ووتەو قسەکەی (ئیمامی عەبدوڵای کوڕی عەبباس) ڕوونی دەکاتەوە کە (الحجر الأسود ليس من صفات الله) یانی بەردە ڕەشەکە سیفاتی خوا (ﷻ) نی‌یە هەروەك لای هەموو کەسێکی ژیر ئەمە سەلمێنراوە. مجموع الفتوى ج٦ لاپەڕە (٣٩٨)

نمونەی دووەم :

فەرموودەی (قلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن ) واتە: دڵی بەندەکانی خوا لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی پەروەردگاردان..

لە وەڵامدا دەڵێین :- بەڵیٚ ئەمە فەرمودەیەکی (صحيح)ە کە ئیمامی‌موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە بابی دووەم لە کتێبی (القدر) لە صحیحی موسلیمدا لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە لە پێغەمبەری خواوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵیٚ (إن قلوب بني آدم كلها بين أصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد يصرفه حيث يشاء) واتە: بێگومان دڵی مرۆڤەکان هەموویان لە نێوان دوو پەنجەی پەروەردگاردان، چۆن دڵی یەك ئینسان هەر چۆن بیەوێت دەیگۆڕێت هەروەها دڵی هەمووشیان بەو شێوەیە..

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمویٚ (اللهم مصرّف القلوب صرّف قلوبنا على طاعتك) واتە: پەروەردگارا، ئەی سوڕهێنەری دڵەکان دەپاڕێینەوە کە دڵەکانمان لەسەر عیبادەت و ستایشی خۆت بسوڕێنی و ڕابهێنی .. هەر بۆیە ئەهلی (سونەت و جەماعەت) لە نەوەکانی سەلەفی صالح بە مانای زاهیری فەرمودەکە کاریان کردووە و دەڵێن بەڵیٚ خوای

گەورە دەست و پەنجەی حەقیقی هەیـە و دەیسـەلمێنن هـەروەك چۆن پێغەمبەرەکـەی (ﷺ)لـە زاهیری فـەرمودەکاندا سـەلماندویەتی ، وەهیچ مـەرج و پێویسـت نیـیە کــە دەوترێـت (دڵــی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەی پەروەردگاردان) مەبەست پیّی دەست لیّ دانی حەقیقی بێت لە پەروەردگارەوە بۆ دڵی بەندەکان ، تا ناچار بین (تأویل) ی بکەین و لەمانای زاهیری لابدەین بە گومانی ئەوەی کە گوایە (إن الحدیث موهم للحلول) یانی ( ئەو دوو فەرمودەیەی سەرەوە وەهـم و گومان دروست دەکات بۆ تێکەڵ بوونی خـوا (ﷻ ) بـە لاشـە و جەسـتەی مرۆڤەکانـەوە). بـۆ نمونە ئەو (هەور و تەمەی) کە خوای گەورە موسەخەری کردووە لە نێوان ئاسمان و زەویدایە لە هەمان کاتدا تێکەڵ بە ئاسمان و زەوی نـەبوە! یـان دەوتـرێ مـانگی (چـواردە شـەو) لـەنێوان مەککە و مەدینە دایە لەگەڵ ئەوەشدا نێوان مانگ و مەککە ومەدینــە زۆر دورە و نێـوان هـەردوو شارەکەش هەر دوورە.

کەواتە ئاسایی یە گـەر بوتـرێ دڵـی بـەندەکانی خـوا لـە نێـوان دوو پەنجە لـە پەنجەکانی پەروەردگاردایە بە مانای حەقیقی و ڕاستی . بەڵام مـەرج و لازمیـش نیـیە دڵەکان کـە لـەنێوان پەنجەکانی پەروەردگاردان مەبەست پـیّی دەسـت لێدانـی ڕاسـتەوخۆ و تێکـەڵ بـوون بێـت بـە جەستەی مرۆڤەکان..

نمونەی سێیەم:

فەرمودەی (إني أَجِدُ نَفَسَ الرحمن من قبل اليمن) واتە: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئەفـەرموێ:- بێگومان من خۆشی و شادو دەرگای خـێر کـە خـوای گـەورە بیکاتـەوە لـە ئیمـانداران لـە ڕووی وولاتی یەمەنەوە دەیبینم لەوێوە دێت بۆ شوێنەکانی تر..

وەلامیشمان بۆ ئەم فەرمودەیە:- بەڵێ ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) لە کتێبە بە نرخەکەی (المسند) دا لــە ئـەبو هورەیرە وە(ڕەزای خـوای لیّ بێـت) ئـەویش لـە پێغەمبـەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی (ألا إن الأيمان يَمانٍ، والحكمة يَمانية، وأجد نَفَس ربكم من قبل اليمن ). قال في جمع الزوائد رجالـه رجـال الصحیـح ، وقـدروى البخـاري نحـوه في كتـاب (التأريخ الكبير).. مانای فەرموودە کە ئەمەیە ((بەڵێ بەڕاستی ئیمان شتێکی بە فـەڕ و پـیرۆز و ئاسانە ، حیکمەت و داناییش لە خەڵکی وولاتی یەمەنەوە سەر هەڵدەدات)) بۆیە ئـەهلی سـونەت

ئەم فەرمودەیە لەسەر مانای زاهیر وەردەگرن و (نَفَس) نـاوی (مصـدر)ی نَفَس ینفس تنفسیاً) وەك شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن لە سەرچاوەكانی (النهایە) و (القاموس) و (مقاییس اللغە) باسیان كردووە ئەوەتا لە كتێبی (مقاییس اللغە)دا دەڵێ ((النَفَس: كل شیء یفرج بە عـن مكـروب فیكون معنی الحدیث أن تنفیس اللە تعالی عـن الۆمنـین یكـون مـن أهـل الیمـن)). واتـە: (النفس) هـەموو ئـەو شـتانەیە كـە ئینسـان بـەهۆی ئەوانـەوە دەرگـای خـێر و خۆشـی لێبكرێتـەوە و نارەحەتیەكانی لەسەر لا چێت ، بۆیە مانای ڕوونی فەرمودەكە ئەوەیە كە دەرگای خێرو خۆشی كە پەروەردگار دەیكاتەوە لەسەر ئیمانداران لە ڕێگای خەڵكی یەمەنەوە دەبێت.. ئەوەتا شێخو لئیسلام ئیبنولتە یمیە ئەفەرموێ ((وهۆلاء هم الذین قاتلوا أهل الردة وفتحوا الأمصار، فبهم نَفَس الرحمان عن المؤمنین الكربات)). واتە: هەر خەڵكی یەمەن بوون جەنگیان دژی پاشگەز بوەكـان كرد و وولاتیان فەتح كرد..وە هەر بەخەڵكی یەمەن بوو خوای گەورە ناخۆشـی و بـەلای لەسـەر ئیمانداران لا برد.. لە كتێبی مجموع الفتاوی جوزئی ٦ لاپەرە (٣٩٨) وەرگیراوە.

نموونەی چوارەم:

خوای گەورە لە سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٩)دا ئەفەرموێ ﴿ ثم استوی إلی السماء﴾ واتە: پاشان ویستی ئاسمان دروسـت بكات و لەسەری جێگیر و ڕاوەسـتاو بێـت (بـەو شـێوەیەی كـە خوا (ﷻ ) خۆی دەزانێت.

ئەهلی (سونەت و جەماعەت) بۆ تەفسیری (إستوی الی السماء) دوو ڕاو تەفسیریان هەیە:

یەكەم:

(استوی) بە مانای (إرتفع الی السماء) واتـە بـەرزی و بڵنـدی بەسـەر ئاسمانـەكاندا ، لـە نـاو زانایانی سەلەفیشدا ئیمامی (ابن جریر الطبری) لە تەفسیرەكەیدا لەسەر ئـەم ئایەتـە ئەفـەرموێ ﴿ و أولی المعانی بقول اللە جل ثناؤە (ثم استوی الی السماء فسواهن ﴾ سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٩) بمعنـی (عـلا علیـهن و إرتفـع) واتـە: باشـترین و پێشـترین مانـای (ثـم اسـتوی الی السـماء) بریتیـیە لە مانای (بەرزی و بڵندی بەسـەر ئاسمانەكانـەوە) پاشـتر ئەفـەرموێ (فدبرهـن بقدرتـە وخلقهن سبع سماوات ) واتە: پەروەردگار بـە دەسـەلات و قودرەتـی خـۆی ڕێكـی خسـتوون بـە حەوت ئاسمان دروستی كردوون) هەر بۆیە ئیمامی (البغوی) لە تەفسیرەكەیدا ڕای (ابـن عبـاس)

و زۆربەی زانایانی سەلەفی هێناوە کە پابەندن بە زاهیری لــە فزی (إستوی) بە مانای بـەرزی و بڵندی و گێڕانەوەی (چۆنێتی) ئەو بەرزی و بڵندییە بۆ لای خوای باڵا دەست..

دووەم:

مەبەست بە(الأستواء) کە لە ئایەتەکە داهاتووە مانای (القصد التام) واتە ویست و مەبەستی تەواو دەگەیەنێ ئەمەش ڕای ئیمامی (ابن کثیر)ە لە تەفسیری سورەتی (فصلت)دا. ئەوەتا (ابن کثیر) دەڵێ (ثم استوی الی السماء) أی (قصد الی السماء) والأستواء هنـا ضمـن معنـی القصـد و الأقبال لأنە عدی ب(إلی). واتە: لەبەر ئەوەی پاش ووشەی (إستوی)(الی) هـاتووە کەواتـە مانـای قەسد و ڕووڵێکردن دەگەیەنێ وە ئیمامی (البغوی) دەڵێ (استـوی الی السـماء أی عمد الی خلـق السماء) واتــە بڕیـاری ئاسمـان دروسـت کردنـیدا: هـەر بۆیـە دەڵێـین ئـەم ڕاو مەزهەبانـە دەقـە شەرعیەکان لە مانای زاهیری خۆی لا نادەن ، چونکە ووشەی (استوی) کە (فیعلە) حــەرفێك بـە دوایدا هاتووە کە مانای مەبەست و کۆتایی (الغایة و الأنتهاء) دەگەیەنێ ئەویش حەرفی (الی)یـە کە مانای فیعلەکە گونجاوە لەگەڵ نزیکـی حـەرفی (الی)پێیـەوە.. بـۆ نموونـە خـوای گـەورە لـە سورەتی (الأنسان) ئایەتی (٦)دا ئەفەرموێ ﴿ عینـاً یشـرب بـها عبـاد الله ﴾. واتـە: کانییەکـە، بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە). جا لـێرەدا فیعلـی (یشـرب) هـاتووە و بـە دوایـدا حـەرفی (ب) هاتووە کە (بها)یە و مانای (لێخواردنەوە تا تێر بوون دەگەیەنێ) واتــە (یشـرب بـها یـانی یـروی بها) چونکە سیاقی جوملە کە ئەمە دەخوازێ.

نموونەی پێنجەم و شەشەم:

خوای گەورە لە سورەتی (الحدیـد) ئایـەتی (٤)دا ئەفـەرموێ ﴿ وهـو معکـم أینمـا کنتـم ﴾. واتە: لەهەر شوێنێکدا بن زاتی خودا (ﷻ) لەگەڵتاندایە) وەلەسورەتی (المجادلە) ئایـەتی (٧)دا ئەفەرمووێ ﴿ولا أدنی من ذلك ولا أکثر الا هو معهم أینما کـانوا﴾. واتـە: لـەو ژمارانـە کـەمتر یـا زیاتریش نییە کە زاتی خودا (ﷻ) لەگەڵیاندا نەبێت لەهەر کوێیەکدابن).

جا لێرەدا دەڵێین: هەر چـی لـەم دوو ئایەتـەدا هـاتووە هـەمووی حەقـە و پێویسـتە لەسـەر مانای زاهیری وەری بگریـن ، بـەڵام مانـای حـەقیقی و زاهـیری کامەیـە؟ ئایـا ئەوەیـە کـەبوترێ

حەقیقەت و زاهیری ئەم دوو ئایەتە ئەوەیە کەخوای گەورە لەگەڵ بەندەکانیدایە بەتێکەڵ بوون لەگەڵ جەستە و لاشەیانداو شوێنی حەوانەوەیاندا؟

یان ئەوەیە کە بڵێین: زاهیر و حەقیقەتی مانـای هـەر دوو ئایەتەکە ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە لەگـەڵ عەبدەکانیدایـە بـەعیلم و قـودرەت و بیسـتن و بینـین و دەسـەڵاتی خـۆی دەوری داون و هیچ شتێکی لێ ون نابێت ، ئەمەش ماناکانی (ربوبیة)ی خوای تەعالا دەگەیـەنێ کە لەسەر عەرشی خۆیەتی و لەسەروی هەموو مەخلوقاتەوەیە؟

جا گومان نییە کە ڕاو بۆ چوونی یەکەم لەگەڵ سیاقی ئایەتـەکاندا نـاگونجێ و ئـەو (معیـة) (لەگەڵدا بوونە) ئیضافة کراوە بۆ لای خوا (ﷻ) کە دەفەرمووێ ﴿ وهو معكم ﴾ یا ﴿وهو معهم اينمـا كـانوا ﴾ هـەروەها خـوا (ﷻ) زۆر لـەوە گـەورەتر و بڵنـد تـرە، کـە هیـچ شـتێك لـە مەخلوقاتەکانی بتوانێت دەوری بدات!!

خاڵێکیتری گرنگ ئەوەیە کە (معیـة) لـە زمـانی عـەرەبیدا کـە قورئـان بـەم زمانـە هاتوەتـە خوارەوە ئەمەیە کە:- (معیە) و لەگەڵدا بوون هەرگیز مانای (إختلاط) و تێکەڵ بوون پێکەوە لە (مکـان) شوێنێکدا ناگەیـەنێ بـەڵکو (معیـە) مانـای (مطلـق المصاحبـة) لەگـەڵدا بوونـی گشـتی دەگەیەنێ و پاشان بە پێی شوێن و سـیاقی ئایەتـەکان تەفسیر دەکرێن هـەر بۆیـە تەفسیری (معیە الله لخلقه بما يقتضی الحلول و الأختلاط باطل من وجوه) :- واتـە لەگـەڵدا بوونـی خـوای گەورە بۆ بەندەکانی کە مانای ئاوێتە بوون و تێکەڵی بە لاشەیبەندەکانیەوە بگەیـەنێ بـەتاڵ و بێ مانا و بەڵگەیە لە چەند ڕوویەکەوە:

١-ئەم ڕاو بۆچونە پێچەوانەی تەواوی کۆی دەنگی ئەهلی سـەلەفە (إجمـاع السـلف) و هیـچ زانایەکیان وەها تەفسیرێکی بۆی نەبوە بەڵکو یەك دەنگن لەسەر ئینکاری کردنی .

٢-ئەم ڕاو بۆچونە پێچەوانەی بەرزی و بڵندی خـوای گەورەیـە کـە بـە قورئـان و سـونەت و عەقڵ و ئیجماعی سەلەف سەلمێنراوە، جا هەر ڕاو بۆچونێکیش کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە بـە قورئان و عەقڵ و ئیجماع سەلمێنرا بێت، بێگومان بەتاڵ و بێ جێیـە، کەواتـە تەفسیری (معیة الله) بە (الأختلاط و الحلول) بەتاڵ و بێ بەڵگەیە.

٣-هەر كەسێك كە نەفام و نـەزان نـەبێ بـە زمـانی عـەرەبی و نـەزان نـەبێ بـە عەزەمـەتو دەسەڵاتی پەروەردگار هەرگیز پەنا بۆ ئەوە نابات كە تەفسیری (معیه الله) بكات بە (الأختلاط و الحلول) چونكە ئەم تەفسیرە بەرهەم و داخوازی بەتاڵی لێ دەكەوێتەوە كـە زیـادە ڕەوی یـە لـە گەورە كردنی مەخلوقات وبچوك كردنەوەی خوا و قودرەت و دەسەڵاتەكانی پەنا بەخوا .

بەڵێ مانای زاهیری هەردوو ئایەتەكە بە شێوەی تەفسیری سەلەف بـوو كـە (لا یكون ظاهر الحق الاّ حقا ولا یمكن أن یكون الباطل ظاهر القرآن أبداً).

هەربۆیە شێخو لئیسلام ئیمامی ئیبنو لتەیمیە لە كتێبی (الفتاوی الحمویه) ج٥ لاپەڕە (١٠٣) دا دەفەموێ : ئەم لەگەڵدا بوونە (معیة) ماناكانی جیاوازن بە پێی سیاق و شوێنی ئایەتەكان ، ئەوەتا كاتێ لە سورەتی (الحدید) ئایەتی (٤) دا دەفەرموێ ﴿ یَعلَمُ مـایلِجُ فی الأرض ومـا یَخرُجِ فیها تا دەگاتە وهو معكم أینما كُنتم ﴾ زاهیری ئایەتەكە ئەوە دەخوازێ كە حوكم و داخـوازی ئایەتەكە ئەمەیە كە ﴿ وهو معكم﴾ یانی (مطلع علیكم، شهید علیكـم، و مُهَیمن عـالِمٌ بكم وهـذا معنی قول السلف إنه معهم بعلمه) واتە ﴿وهو معكم﴾ یانی ئاگای لێتانە و شایەتە بەسـەرتانەوە و بەدەسەڵات و قودرەتە و زانایە بە كردەوەكانتان ئەمەش مەزهەبی سەلەفە كە: خوای گـەورە لەگەڵ عەبدەكانیدایە بە عیلم و زانینی خۆی نـەك بەشێوەی ئاوێتـە بـوون و تێكـەڵاو بـوون بـە جەستەو لاشەیان؟؟

یان كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبو بەكری سدیق ئەفەرموێ كـە دەچنـە ئەشكەوتەكەوە ﴿لا تحزن إن الله معنا﴾ سورەتی (التوبة) ئایەتی (٤٠) واتە : ئـەی ئـەبو بـەكر غـەمبار و بـێ تاقـەت مەبە خوای گەورە لەگەڵ ئێمەدایە ، جا ئەم (معیه) لێرەدا بە مانای (الأطلاع و النصر و التأیید) واتە: ئاگاداری خوای گەورەو پشت گـیری و سـەر خستنی بۆ پێغەمبـەری خـوا و ئـەبو بـەكری سدیق .. سەلامی خوا لەسەریان بێت .

دواتر ئیمامی ئیبنولتەیمیە ئەفەرموێ (لەفزی (معیة) لە قورئان و سوننەت دا لـە چـەندەها شوێن دا بەكارهاتووە و لە هەر شوێنێكدا مانا و مەبەستێكی هەیـە كـە جیـاوازە لـە شـوێنەكەی تر، جا مانا و مەبەستەكان یا یەكن یا ڕێژەیەكی هاوبەش (قدر مشترك) هەیـە لـە نێوانیـاندا كـە

سیفەتێكی لایەق بــە پــەروەردگار دەســەلمێنیّ لەگــەلّ ئەوپــەڕی قــودرەت و دەســەلاّتدا و دەرنەچونیش لە مانای زاهیری دەقە شەرعیەكان..

جا ئەگەر دیسانەوە بچینەوە خزمەت سورەتی (المجادلة) و ئایەتی(٧) كە سەرەتاو كۆتـایی ئایەتەكە باس لە عیلمی خـوای گەورە دەكـات بـە كـارو كـردەوەی بـەندەكانی ، دوور لـەمانای ئاوێتە و تێكەلاّو بوونی پەروەردگار بە جەستە و لاشەی بەندەكانیەوە .. دەفەرموێ ﴿ألم تر أن الله يعلم ما في السموات وما في الارض مـايكون من نجوى ثلاثـة الا هـو رابعـهم ولا خمسةٍ الا وهـو سادسُهم ولا أدنىٰ من ذلك ولا اكثرَ هو معهم اين ماكانوا ثم يُنبئـهم بمـا عملوا يـوم القيامـة ان الله بكل شيء عليم﴾. واتە: (ئایا سەرنجت نـەداوە كـە بەڕاسـتی خـوا بەهـەرچی لـە ئاسمانـەكان و زەویدا هەیە زاناو ئاگایە ، سیّ كەس نی‌یە چپە بكەن بەیەكەوە خـوا چوارەمیـان نـەبێت، پێنـج كەس نی‌یە ئەو زاتە شەشەمیان نەبێت ، لەو ژمارانە كـەمتر یـان زیـاتریش نی‌یـە كـە ئـەو لایـان نەبێت و ئاگادار نەبێت بەسرتە و چرپەیان ، لەهەر شوێنێك و لەهەر كوێدا بن، پاشـان لـە ڕۆژی قیامەتدا ئاگاداریان دەكاتەوە بەهەموو ئەو كار و كردەوانەی كە ئەنجامیانداوە ، چونكە خوا بە هەموو شتێك زانایە) كەواتە زاهیری ئایەتەكە ئەوە دەخوازیّ كە (وهو معهم) یانی خـوای گـەورە بە علیم و زانستی خۆی لەگەڵیاندایە و هیچ شتێكی لیّ وون نابێت لەكردەوەكانیان نـەك بـەمانای ئەوەی كە خوای گەورە تێكەلّ و ئاوێتەی بەندەكانیەتی یا لەسەر زەویدا لەگەڵیاندا بێت !!

هەروەها ئایەتەكەی سورەتی (الحدید) ئایەتی (٤)یش هەمان حەقیقەت دوپات دەكاتــەوەو لە پێشدا باسی بوونی خوای گەورە دەكات لەســەر عەرشــی خـۆی و پاشـان بەگشـتی زانست و زانیاری خــوا دەربـارەی مەخلوقاتــەكانی و دواتریـش ســەلماندنی بینینـی خـوای بالاّدەست بـۆ سەرجەم كردەوەی بەندەكانی. دەفەرموێ ﴿هو الـذي خلـق السـماوات والارض في ستة ايـام ثـم استوى على العرش يعلم ما يلج في الارض وما يَخرُجُ منها وما ينَزل من السماء وما يَعرُجُ فيها وهــو معكم اينما كنتم والله بما تعملَون بصير﴾ واتە:هەر ئەو زاتە خۆی ئاسمانەكان و زەوی لە شــەش ڕۆژدا دروست كـردووە، لـەوەو دوا لەســەر تـەختی فـەرمانڕەوایی خـۆی پایـەدار كـرد (چۆنێتـی وەستان لەسەر عەرش خوای گەورە خۆی دەزانێت) هەر خــۆی دەزانێـت چـی دەچێـت بـەناخی زەویدا و چیشی لیّ دێتە دەرەوە ، چی لەئاسمان دێتە خوارەوە و چی پیــادا ســەردەكەوێ، جـا

لەهەر شوێنێکدابن، ئەو زاتە لەگەڵتاندایە و پێتان دەزانێت ، دڵنیابن کەخوا بەهەموو ئەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە).

جا گەر خوای گەورە تێکەڵ بێت بە جەستەی بەندەکانیەوە لەزەویداو لەسەرەتای ئایەتەکەشدا فەرموی خوای گەورە لەسەر عەرشی خۆی ڕاوەستاوە ، ئەوە ئەم دووقسەیە پێچەوانەی یەکتر دەبێت.. بۆیە حەقیقەت و ڕاستیەکەی فەرموودەکەی خوای گەورەیە کە خوای بالأدەست لەئاسمانەو لەسەر عەرشی خۆی ڕاوەستاوە -بەو شێوەی کە خۆی دەزانێت- وەبە عیلم و قودرەت و بیستن و بینینی خۆی لەگەڵ بەندەکانیدایە لەسەر زەویدا و لەم قسەیە زیاتر بەتاڵ و بێ بەڵگەیەو جا کە خوایەك (ﷻ) حاڵ و وەزعی بەندەکانی بە ووردو درشتی بزانێت و گوێی لەهەموو قسەو داواکانیان بێت و (يُؤتِي الملك من يَشاء ويَنزعُ المُلك ممن يشاء ويُعز من يَشاء و يُذِلُ من يشاء) کە ئەمانە هەموویان کەماڵی دەسەڵات و توانای پەروەردگار پیشان دەدەن باخوای گەورەش لەسەر عەرشی خۆی بێت لە حەقیقەتدا بەڵام بەڕاستی‌و بەحەق خوا (ﷻ) لەگەڵ بەندەکانیدایە بەبێ هیچ تێکەڵی و ئاوێتەبوونێك پێیانەوە.

ئەوەتا شێخولئیسلام ئیمامی ئیبنولتەیمیە لە (العقيدة الواسطية)لاپەڕە (١٤٢)لە ج٣ کەباس لە (المعية) لەگەڵدا بوونی پەروەردگار دەکات ئەفەرموێ (وكل هذا الكلام الذي ذكره الله - سبحانه من انه فوق العرش وانه معنا على حقيقته لايحتاج الى تحريف و لكن يصان عن الظنون الكاذبة) واتە: هەموو ئەو فەرمودانەی کە خوای گەورە باسی خۆی تێدا دەکات کەلەسەر عەرشی خۆیەتی‌و لەگەڵ ئێمەدایە بە حەقیقەت ، هیچ پێویست بەوە ناکات لەماناکانی خۆیان لایان بدەین و تەحریفیان بکەین بەڵکو ئەوەی کە پێویستە لەسەرمان ئەمەیە کەپاك‌و بێگەردی خوای گەورەو ئەو دەقە شەرعیانە بپارێزین لەگومانی درۆ و خەیاڵاتی خۆمان لەکاتی تەفسیر کردنیاندا. هەر بۆیە تەفسیری (المعية : لەگەڵدابوون) بەشێوەیەکی زاهیری و بەمانای حەقیقی کەلایەق بێت بە پەروەردگارەوە ، هیچ کات پێچەوانەو دژی ئەوە نیە کەخوای گەورە بەرز و بڵندەو لەسەر عەرشی خۆیەتی لەسێ ڕووەوە:

١-قورئانی پیرۆز کە فەرمودەی خوای پەروەردگارە و هەگیز دەقەکانی قورئان پێچەوانەی یەکترنین ئەوەتا خوای گەورە لەقورئاندا هەردوکیانی پێکەوە باس کردوە بۆ وەسفی خۆی

ئه‌فه‌رموێ (وهو معكم) له‌ئایه‌تێكی تریشدا ئه‌فه‌رموێ (ثم استوی علی العرش) كه‌واته‌ له‌گه‌ڵ به‌نده‌كانیدا بوون به‌مانای زاهیری و واقعی و هه‌روه‌ها له‌سه‌ر عه‌رشی خۆی بوونیش ، هه‌ردوكیان كۆكراونه‌ته‌وه‌ له‌ قورئاندا و، جا هه‌ر ئایه‌ت و باسێك كه‌به‌زاهیری ماناكانی گومانی دژایه‌تیكردن و پێچه‌وانه‌ی یه‌كتری لێ بخوێنرێته‌وه‌ ، بێ گومان كاتێ وورد ده‌بینه‌وه‌ له‌ماناكان و ده‌قه‌كان كۆده‌كه‌ینه‌وه‌ بۆت ده‌سه‌لمێ كه‌پێچه‌وانه‌و دژی یه‌كترنین وه‌ك له‌ سوره‌تی (النساء) ئایه‌تی(٨٢) دا ئه‌فه‌رموێ ﴿افلا يتدبرون القرآن ولو كان من عند غير الله لوجدوا فيه إختلافاً كثيراً﴾ واته‌: (ئه‌وه‌ بۆ ئه‌وانه‌ سه‌رنجی قورئان ناده‌ن و لێكی ناده‌نه‌وه‌ و لێی ورد نابنه‌وه‌؟ خۆ ئه‌گه‌ر له‌لایه‌ن كه‌سێكی تره‌وه‌ بوایه‌جگه‌ له‌ خوا بێگومان جیاوازی و دژایه‌تیه‌كی زۆریان تێدا ده‌دۆزیه‌وه‌).. جا ئه‌گه‌ر پاش لێوورد بوونه‌وه‌ش له‌ ئایه‌ته‌كان هه‌ر بۆت ڕوون نه‌بویه‌وه‌ ! ئه‌وكات ده‌بێ هه‌ڵوێستی (الراسخون في العلم) (ئه‌وانه‌ی قوڵ بوونه‌ته‌وه‌ له‌عیلم و زانیاریدا)ت هه‌بێت كه‌قورئان ئه‌فه‌رموێ له‌باره‌یانه‌وه‌(آمنا به كل من عند ربنا) سوره‌تی (ال عمران) ئایه‌تی(٧) واته‌: (ئه‌و كه‌سانه‌ی له‌ زانستدا قووڵ بونه‌ته‌وه‌ ده‌ڵێن : ئێمه‌ باوه‌ڕی دامه‌زراومان به‌ هه‌موو ئه‌و ئایه‌تانه‌) هه‌یه‌ كه‌له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارمانه‌وه‌ دابه‌زیوه‌)

بۆیه‌ ده‌بێ گه‌ر بابه‌ت و ئایه‌تێك هه‌بوو ماناكه‌ی له‌ئێمه‌وه‌ دیار نه‌بوو بیگێڕینه‌وه‌ بۆ لای په‌روه‌ردگار و ده‌بێ بزانین تێگه‌یشتن‌و زانینی ئێمه‌ ناته‌واوه‌ و ئایه‌ته‌كانی قورئان هیچ كات پێچه‌وانه‌ی یه‌كترنین .. هه‌روه‌ك چۆن ووته‌كه‌ی شێخولئیسلام ئیبنولته‌یمیه‌ پێشتر هێنامانه‌وه‌ كه‌ فه‌رمووی (كما جمع الله بينهما) واته‌ هه‌روه‌ك چۆن خوای گه‌وره‌ هه‌ردوكیانی پێكه‌وه‌ كۆكردۆته‌وه‌) یانی بوونی خۆی له‌سه‌ر عه‌رش و له‌هه‌مان كاتدا له‌گه‌ڵ به‌نده‌كانیشدایه‌)

هه‌روه‌ها ئیمامی ئیبنولقه‌یم له‌كتێبی (مختصر الصواعق) له‌دانانی (ابن الموصلي) لاپه‌ڕه‌ (٤١٠) ئه‌فه‌رموێ (فأخبر سبحانه و تعالى انه خلق السموات والارض وانه استوى على عرشه وانه مع خلقه يبصر أعمالهم من فوق عرشه فعلّوه لا يناقض معيته، ومعيته لاتبطل علوّه بل كلاهما حق) واته‌: خوای گه‌وره‌ ئاسمانه‌كان و زه‌وی دروست كردوه‌ ، وه‌له‌سه‌ر عه‌رشی خۆی جێگیره‌و، هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ عه‌بده‌كانی خۆیشی دایه‌و له‌سه‌ر عه‌رشی خۆیه‌وه‌ كرده‌وه‌كانیان ده‌بینێ ، كه‌واته‌ به‌رزی و بڵندی خوا (ﷻ) دژ نی‌یه‌ به‌بوونی خوا له‌گه‌ڵ عه‌بده‌كانیدا هه‌روه‌ها

بوونی خوا (ﷻ) لەگەڵ عەبدەکانیدا هیچ پێچەوانـەو دژ نی‌یـە بـەوەی کـەخوای گـەورە لەسـەر عەرشی خۆی بێت بەڵکو هەر دوو ماناکەی هەر حەقن).

٢-حەقیقەتی (لەگەڵدابوون - المعیة) هیچ کات مەرج نی‌یە کە ئەوە بخوازێ لەیـەك شـوێندا کۆببنەوە ، بۆ نموونە دەوترێ (مازلنا نسیر و القمر معنا) واتـە ئێمـە بـەردەوام ڕێگـا دەبڕیـن و دەڕۆین و مانگیش لەگەڵماندایە (ئەم قسەیەش ئەوە ناگەیەنێ کە مانگ لە ئاسمانەوە دابـەزیوە بۆ سەر زەوی و لەگەڵ خەڵکدا دەڕوات ، جا گەر ئەمە بگونجێ لە حەقی مەخلوقاتدا وابێت ئەی بۆچی لەحەقی خوای گەورە دا نەگونجێ؟!

بۆ پشتگیری ئەم قسەیە شێخولئیسلام ئیبنولتەیمیە لە (الفتاوی الحمویـە) لاپـەڕە (١٠٣) دا ئەفەرموێ (کلمة (مع) في اللغة اذا اطلقت فلیس ظاهرها في اللغة الا المقارنة المطلقة من غیر وجوب مماسة ومحاذاة عن یمین او شمال فانه یقال مازلنا نسـیر والقمـر معنـا او النجـم معنـا ویقـال هـذا المتاع معي لمجامعته لك وإن کان فوق رأسك ، فالله مع خلقه حقیقة وهو فوق عرشه حقیقة) واتـە : ووشەی (مع) لەگەڵ بوون ، لەزمانی عەرەبیدا گەر بەگشتی بەکار هات ئەوە مانـای (المقارنـة المطلقة)بەرانبـەر بوونـی یـەکتر بەگشـتی دەگەیـەنێت بـەبێ ئـەوەی کـە بوتـرێ لێکیـان داوەیـا هاوشـانی یـەکترین لـە ڕاسـتەوە یـا چـەپ ، ئـەوەتا دەوتـرێ : بـەردەوام دەچین و مـانگ یـان ئەستێرە لەگەڵماندایە یان دەوترێ ئەم کەل و پەلە لەگەڵماندایە لەبەر ئەوەی تۆ هەڵتگرتووە با لەسـەر سەریشـت بێـت، کەواتـە خـوای گـەورەش بەحەقیقـەت لەگـەڵ عەبدەکانیدایـەو لەسـەر عەرشی خۆشیەتی هەر بە حەقیقەت و ڕاستی).

٣- جا گەر لە حاڵەتێکدا بکرێ و بوترێ : هەرگیز ناگونجێ لـە حـەقی مـەخلوقاتدا لـە یـەك کاتدا (المعیة و العلو)یانی لەگەڵدا بوون و بەرزی و بڵندبوون کۆببێتەوە، ئێمە دەڵێین: لە حـەقی خوای گەورەدا شتی وەها زۆر ئاسان و سادەیە و دەگونجێ و خوای گەورە بۆ خۆی هەردوکیان (المعیـة و العلـو)ی کۆکردۆتـەوەو هـەرگیز قیاسـی مـەخلوق بـەخالق نـاکرێ، وەك لـە سـورەتی (الشوری) ئایەتی (٧) ئەفەرموێ ﴿لیس کمثله شيء وهو السمیع البصیر﴾

## ڕونكردنەوەیەكی زیاتر سەبارەت بە - معیه الله تعالى لخلقه - لەگەڵ بوونی خوای گەورە بۆ بەندەكانی

ئەوانەی توێژینەوە وقسە وباسیان كردووە لەم بارەیەوە بوونەتە سێ كۆمەڵ:

كۆمەڵی یەكەم: دەڵێن بێگومان (معیة الله تعالى لخلقه) لە گەڵ بوونی پەروەردگار بۆ بەندەكانی ، لە حاڵەتی لەگەڵ بوونی گشتیدا (المعیة العامة) مانای دەوردان و ئاگاداری تەواوی خوای تەعالا دەگەیەنێ لە حاڵ و وەزعی تەواوی بەندەكانی ، وە لە حاڵەتی لەگەڵ بوونی تایبەتیدا (المعیة الخاصة) مانای سەرخستن و پشتگیری تەواوی خوای تەعالا دەگەیەنێ بۆ بەندە صالحەكانی لەگەڵ سەلماندنی بەرزی وبڵندی زاتی خوا (ﷻ) وجێگیر بوونی لەسەر عەرشی خۆی ، ئەمەش ڕای زانایانی سەلەفە و مەزهەبەكەیان حەق و ڕاستە.

كۆمەڵی دووەم: دەڵێن مانای (معیة الله لخلقه) لەگەڵ بوونی خوای تەعالا بۆ بەندەكانی ئەوە دەخوازێ كەلەسەر زەوی لە گەڵیاندایە وتێكەڵ و ئاوێتەیان دەبێت وهەروەها نەفی بەرزی وبڵندی بۆ خوا(ﷻ) دەكەن وبوونی خوای گەورە لەسەر عەرش ناسەلمێنێت ، ئەمانەش كۆمەڵی (الحلولیة)ن واتە ئەوانەی باوەڕیان وایە كە زاتیپەروەردگار تێكەڵ و ئاوێتەی زاتی سەرجەم مەخلوقاتەكانی بووە لێیان جودا نابێتەوە، ئەمانەش لەسەر مەزهەبی (الجهمیة)ن كە لەپێشەوە باسمان كردن ، بێگومان ڕاو مەزهەبی ئەمانە زۆر بە تاڵ و بێ جێیە و زانایانی سەلەف بە كۆی دەنگ بەرپەرچیان داونەتەوە.

كۆمەڵی سێیەم: دەڵێن بێگومان (معیة الله تعالى لخلقه) ئەوە دەخوازێ كەخوای گەورە لەسەر زەوی لەگەڵ بەندەكانیدایە لەگەڵ سەلماندنی بەرزی و بڵندی بۆ پەروەردگار لەسەر عەرشی خۆی ئەمەش ڕای شێخولئیسلام ئیبنولتەیمیەیە لە كتێبی (مجموع الفتاوى ج٥ لاپەرە ٢٢٩).

جا ئەوەی جێگای تێبنیی یە ! کۆمەڵی دووەم بـە حیسـاب و خەیاڵی خۆیـان گوایـە ئیش بە (زاهیری دەقەکانی قورئان و سـونەت دەکـەن سـەبارەت بـە لـەگەڵ بوون (معیـة) و بـەرزی خوای تەعالا ، چونکە وا خـەیاڵ دەکەن کـە قورئان دەفـەرموێ ﴿ وهو معكم ﴾ دەڵێن ئەوەتا زاتیخوای گـەورە خۆی لەگەڵ زاتی ئینسـانەکاندایە کە واتە لە دەسەڵات و گەورەیی خـودایە کە ئاوێتـە و تێکەڵی زاتی هەموو مـەخلوقاتەکان بووە بە هۆی ئەو ئاوێتە بوونـەوە ئـاگای لـە هەموو مەخلوقات هەیە ! ! دیارە ئەمەش مەزهەبێکی سـەر لێشـێواوی و گومڕاییـە و هــەرگیز دەقەکانی (معیە ) لـەگەڵدا بوون مانای (الحلول) تێکەڵی و ئاوێتـە بوون نـاگـەیەنێ و هــەرگیز مانای زاهیری فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ناگونجێ بەتاڵ و بێ بەڵگەبێت.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم تیشـك بخەمـە سـەر سـێ خـاڵ و وەك هەڵوێسـتەیەك زیـاتر رونکردنەوەیان لەسەر بکەم.

خاڵی یەکەم: بێگومان تەفسیری سەلەفی صـالح لەسـەر (معیـه الله تعـالی) لـە گـەڵدا بوونـی خوای گەورە بۆ بەندەکانی کورت هەڵنایەت بەوەی تەنها بە عیلم و زانیاری خۆی ئاگاداری ووتە وکار و کردەوەیانە بەڵکو (معیە) لە گڵدا بوون هەموو ماناکانی (ربوبیة الله تعالی) پەروەردگارێتی خـوای گـەورە دەگەیـەنێ لـەوەی کـە دەوری عــەبدەکانیخۆی داوە بــە بیسـتن و قـودەرت و دەسەڵاتی خوایی وهیچ شتێکی لێ وون نابێت.

خاڵی دووەم: وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێ کرد ، بەرزی وبڵندی خوای گەورە بـە قورئـان وسونەت وعەقڵ و فیترەتی پاك وئیجماع سەلمێنراوە.

بەڵگەی قورئان: لە قورئاندا بەرز وبڵندی خوای گـەورە بـە چـەند جـۆر وچـەند لـەفزی جیـا لەیەك باس کراوە و سەلمێنراوە ، جارێك بە لەفزی (العلو والفوقیة) بەرزی و لەسـەرەوە بـوون ، وە بە (الأستواء علی العرش) دامـەزراوی لەسـەر عـەرش ، وە بـە (کونـه في السمـاء ) بوونـی لـە ئاسماندا باس کراوە ، بەڵگەی یەکەم لە سورەتی (البقـرە) ئایـەتی (٢٥٥) دا ئەفـەرموێ ﴿وهـو العلي العظيم﴾ واتـە :هـەر ئـەو خوایـەکی بـەرز وبڵنـد و گەورەیـە ) بەڵگـەی دوەم:بۆ (فوقیـە) لەسەرو بوون لە سورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٨) ئەفـەرموێ ﴿ وهـو القـاهر فـوق عبـاده﴾ واتـە

(هەر ئەو خوایە زاڵ وبالادەستە بەسەر هەموو بەندەكانیدا) بەڵگەی سىٰیەم بۆ (الأستواء) لە سورەتی (طه)ئایەتی (٥) ﴿الرحمن على العرش أستوى﴾ واتە( خوای میهرەبان بەسەر تەختی فەرمانرەوایەتی خۆیەوە وەستاوە و لەسەر عەرش دامەزراوە (بەو جۆرەی كە خۆی دەیزانێت)، بەڵگەی لە ئاسمان بوونیش لە سورەتی (الملك) ئایەتی (١٦) دا ئەفەرموێ ﴿ أأمنتم من في السماء أن يخسف بكم الأرض﴾ واتە ( ئایا لەو زاتە ناترسن كەلە سەرووی ئاسمانەوەیە بە ناخی زەویدا بتانباتە خوارەوە ؟!) .

جارێكی تر بەرزی وبڵندی بە لەفزی (صعود الأشياء و عروجها ورفعها اليه) هاتووە .. بەڵگەی یەكەم بۆ (صعود) بەرز بوونەوەی قسە بۆلای پەروەردگار. لە سورەتی (فاطر) ئایەتی (١٠) دا ئەفەرموێ ﴿ إليه يصعد الكلم الطيب﴾ واتە: گوفتاری چاك و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو زاتە -پەروەردگار- بەرز دەبێتەوە..

بەڵگەی دووەم بۆ (العروج) بەرز بوونەوە لە سورەتی (المعارج) ئایەتی (٤) دا ئەفرموێ ﴿تعرج الملائكة والروح إليه﴾ واتە : فریشتەكان وجوبرەئیل بەرز دەبنەوە بۆلای پەروەردگار ، بەڵگەی سىٰیەمی (الرفع إليه) واتە بەرز بوونەوە بۆ لای پەروەردگار لەسورەتی (أل عمران) ئایەتی (٥٥)دا ئەفەرموێ ﴿ إذ قال الله يا عيسى إني متوفيك ورافعك إلَيّ﴾ واتە : كاتێك خوای گەورە فەرمووی ئەی عیسا من ( بە شێوەیەكی ئاسایی تۆ دەمرێنم پاشان تۆ پایەدار و بەرز وبڵند دەكەمەوە لای خۆم.

هەندێ جاریش بەرزی وبڵندی خوای گەورە بەوە دەسەلمێ كە بریار و فرمانەكان لەسەرەوە بۆ خوارەوە ، لە ئاسمانەوە بۆ زەوی ، لەلایەن پەروەردگارەوە بە لەفزی (دابەزین) لە ئاسمانەوە بۆ زەوی لە قورئاندا بەكار هاتووە ، ئەوەتا لە سورەتی (النحل) ئایەتی (١٠٢) دا فەرموێ ﴿ قل نزله روح القدس من ربك﴾ واتە : ئەی محمد(ﷺ) پێیان بڵێ (روح القدس — جوبرەئیل) ئەم قورئانەی لە لایەن پەروەردگارتانەوە بە حەق و راستی دابەزاندوە ، وەلە سورەتی (السجده) ئایەتی(٥)دا ئەفەرموێ ﴿يدبر الأمر من السماء الى الأرض﴾ واتە : خوای گەورە لە ژوور ئاسمانەوە كاروباری زەوی رێكدەخات.

## بەڵگەی سوونەت

سـونەتەکـانی پێغەمبـەری خـــوا(ﷺ) بـە هـەموو جۆرەکـانی فـەرمـــوودە و کــردار و ئیقرارەوە چـەندەها بەڵگـەی (صحیح) ی تێدایە کە گەشتوەنەتە ئاستی (تواتر) بۆ نمونـە، پێغەمبـــەری خـوا(ﷺ) ئـــەفەرموێ لـــە کـاتی ســـوجدەکاندا بڵێین (ســبحان ربـی الأعلـی و بحمده) واتە پاکـی و بێگەردیی و سـوپاس بۆ خوای بـەرز و بڵنـدی مـن) ، وە ئەفـەرموێ (إن الله لما قضی الخلق کتب عنده فوق عرشـــه إن رحمتي ســبقت غضـبي) واتـە: خـوای گـەورە کاتێ بوونەوەری دروست کرد لەسەر عەرش لای خۆی نووسی کە رەحم ومیـهرەبانی من پێش ڕق وتۆڵەم کەوتووە هەروەها ئەفەرموێ (ألا تأمنوني وأنا أمين من في السـماء ) واتـە ئایا ئێوە من بە ئەمین نازانن لـە کاتێکدا ئەوەی لە ئاسماندایە – کە خوای گەورە و فریشـتەکانە منیـان بە ئەمین داناوە).

وە لە پێغەمبەری خـواوە(ﷺ) بـە (صحیح)ی هـاتووە کـە لـە کـاتی ووتـار دانـی جومعـەدا هەردوو دەستی بەرز کردۆتەوە فەرموویەتی (اللهم أغثنا) واتـە خوایـە بـارانی رەحمـەت برژێنـە بەسەرماندا و فریامان بکەوە.

هەروەها لە کاتی ووتـاردانیدا رۆژی عەرەفـە دەسـتی پـیرۆزی بـەرز کـردەوە بـۆ ئاسمـان و فەرمووی (اللهم أشـهد) واتە خوایە تـۆ بـە شـــایەت بـە ، ئـەم فەرموودەیـە لـە وەڵامـی قسـەی هاوەڵانیدا بوو کاتێ ووتیان ( نشـهد أنك قد بلغت وأديت ونصحت) واتە شایەتی ئەدەین کە تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) دینی خوات بە چاکی گەیاندو ئەوەی خێر و نەصیحـەت بێـت ئـەنجامت داوە بۆمان ، هەروەها پێغەمبـەری خوا(ﷺ) پرسیاری کرد لە ئـافرەتێکی کـەنیزەك خـوای گـەورە لـە کوێیە ؟ (أين الله) لە وەڵامدا ووتی (في السماء) لە ئاسماندایە ، بۆیە خێرا پێغەمبەر(ﷺ) ئیقـرار و ئەرێی بۆ کرد و فەرمووی بە خاوەنی ئافرەتەکە ( أعتقها فأنها مؤمنه) واتە: ئـازادی بکـە لـە عەبدایەتی چونکە ئیماندارە.

## بەڵگەی عەقڵ

هەموو عەقلێك ئەوە دەسەلمێنێت كە خوای گەورە خاوەنی سـیفەتی (الكمـال)ە ودوورە لـە هەموو كەم وكورییەك ، جا(العلو) بەرزی وبڵندی سیفەتی (كەماڵ) ەو (السـفل) نزمـی سـیفەتی نـەقس و كەمی‌یـە ، بۆیـە پێویسـتە سـیفەتی (العلـو) بـەرزی بسـەلمیّ بـۆ خـوای گـەورە و پێچەوانەكەی نەفی بكرێت.

## بەڵگەی ( فطرة ) سروشتی پاك

فیترەت و سروشت پاكی بەڵگەیەكی ترە لەسەر سیفەتی (العلو) بەرزی بۆ خوای تاك وتەنها چونكە لە كاتی ترس یا هاوار كردنی ئینساندا دەبینین بەرەو لای راست یا چـەپ سـەیر ناكـات بەڵكو یەكسەر دڵ ودەست ودەم و چاوی ڕوو لە ئاسمان وسەرەوە دەكات.

هەروەها پرسیار لە نوێژ خوێنان بكە كاتیّ لەسوجدەدا دەڵێن (سبحان ربـي الأعلـى) پـاك و بێگەردی بۆ خوای من كەبەرزو بڵندە، لەم كاتەدا دڵیان روو لەكویّ دەكات؟ بێگومان لەئاسمان.

## بەڵگەی ئیجماع و یەكدەنگی زانایان

هەموو زانایانی سەلەف لە صەحابە وتابعین وپێشە وایان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە خوای گـەورە لەسـەر ئاسمانەكانـەو لـەوێش لەسـەر عەرشـی خۆیـەتی ، ئـەوە تـا ئیمـامی ئـەوزاعی ئەفەرمویّ (كنا والتابعون متوافرون نقول إن الله تعالى ذكـره فـوق عرشـه ونؤمـن بمـا جـاءت بـه السنة من الصفات ) واتە ئێمە وهەموو زانایانی تابعین یەكدەنگ بووین لەسەر ئەوەی كـە خـوای گەورە باسی كردووە كە خۆی لەسەر عەرشە و ئیمانمان بـەوەش هەیـە كـە پێغەمبـەر (ﷺ)بـۆی باس كردووین ، هەر بۆیە زانایانی تریـش(إجمـاع) و یـەكدەنگیان لـەم بارەیـەوە نـەقڵ كـردووە بۆمان و ناگونجیّ خیلاف وجیاوازیان هەبێت.

خاڵی سێیەم: نامیلكەیەك لە لایەن منەوە دەرچووە بۆ قوتابیان وتێیـدا لـەبارەی (معیـة الله تعالى) لەگەڵ بوونی خوای گەورە بۆ بەندەكانی وتومە( عقیدتنا أن لله تعـالى معیـة حقیقـة ذاتیـة

تليق به، وتقتضي إحاطته بكل شيء علماً وقدرة وسمعاً وبصـراً وسلطاناً وتدبيراً وأنـه سبحانه منزه أن يكون مختلطاً بالخلق أو حالاً في أمكنتهم وأنه مستو على عرشه كما يليق بجلاله ) واته: عەقيدە وبيروباوەڕی ئێمە ئەمەيە كە : خـوای گـەورە بـە شـێوەيەكی حـەقيقی وزاتـی لەگـەڵ مەخلوقەكانيدايە بەو جۆرەی كە لايەق بێت بە خۆيەوە ، ئەم لەگەڵ بوونە (معية حقيقية وذاتية) زاتی وحەقيقيەش ئەوە دەخوازێ كـە خـوای گـەورە چـوار دەوری هـەموو مـەخلوقاتی داوە بـە زانست ودەسەلات و نەخشە وبيستن وبينينی خۆی بۆيان، لەسەر عەرشی خۆی دامەزراوە، بەو شێوەی كە لايەق بێت پێيەوە ، وەخوای‌ميهرەبان پاك وبێگـەرد وگـەورە تـرە لـەوەی تێكـەڵ و ئاوێتەی مەخلوقات ببێت وبچێتە شوێن وجێگاكانيان.

مەبەستيشم لە برگەی (معية ذاتية) لە گەڵدا بوونی زاتی دووپات كردنـەوەی سـەلماندنی لـە گەڵدا بوونی خوای گەورەيە ،نەك مەبەستم ئـەوە بـێ كـە خـوای گـەورە لەگـەڵ بەندەكانيدايـە لەسەر زەويدا چونكە من پاشتر ووتومە (وأنه سبحانه منزه من أن يكون مُختلِطاً بالخلق أو حـالاً في أمكنتهم) ئيتر چۆن بە پێچەوانەوە شتێكی تر دەڵێم ؟! لەمەش زياتر من لە هەمان ناميلكەدا بە راشكاوی ووتومە (ونرى أن من زعم أن الله بذاته في كلِ مكـان فـهو كـافر أو ضـال إن إعتقـده وكاذب إن نسبه الى غيره من سـلف الأمـة أو أئمتـها) وات ڕاو بۆچوونـی ئێمـە ئەوەيـە هەركـەس بيروباوەڕی وا بێ كە خوای گەورە بە زاتی پيرۆزی خۆی لەهەموو شوێنێكدا هەيە ئەوە كافرە يا گومڕايە، وە درۆزنيشە گەر ئەم قسەيە بداتە پاڵ سەلەفی صالح يان پێشەوايانی سەلەف.

پێم وانييـە هيـچ كەسـێكی عـاقڵ كـە خوانـاس بێـت ويـاوەڕی بـە قـودرەت ودەسـەلاتی پەروەردگار هەبێت باوەڕی وابێت كە خوای گەورە بە زاتی پيرۆزی خۆی لەسـەر زەويـدا لەگـەڵ مەخلوقاتدايە وە من بەردەوام پێشتر و ئێستاش لەهەموو كۆڕ و كۆبونەوەيەكی خۆمدا دژابـەتی ئەم ڕاو بۆچوونەم كردووە ، ئەپارێمەوە لە خوای ميهرەبان منيش و سەرجەم براياني، ،،،، سلّمانم جێگير ودامەزراو بكات لە دونيا و لە پاشەرۆژدا. بۆيە بە پێويسـتی دەزانم ووشـەی (ذاتيـة) لـەو رستەيەی پێشوو دەربهێنم ولای بـەرم كـە ووتم (عقيدتنـا حقيقـة ذاتيـة تليـق بـه) چونكـە پـاش بڵاوبونەوەی ئەم رستەيە ديار بوو ووشەی (ذاتية) گومان وكێشەيەكی لە بيرو بۆچوونی خەڵكدا

دروست کرد بوو ، بۆیە پاشتر ووتارێکم لە گۆڤاری (الدعوة) بڵاوکردەوە لە ٤ محرم ١٤٠٤ کۆچی و لە ژمارە (٩١١) ووتومە (قررت ما قرره شیخ الإسلام أبن تیمیة -رحمـه الله- مـن أن معیـة الله تعالی لخلقه حـق علـی حقیقتها ، وأن ذلـك لا یتقضـي الحلـول والأختـلاط بـالخلق فضـلاً عـن أن یستلزمه).

واتە ئەوەی من سەڵماندوومە بـاوەڕم پێیـەتی ئەوەیـە شیخولئیسلام ئیمامی ئیبنولتەیمیـە سەڵماندویەتی کە لەگەڵ بوونی- معیه الله -خوای گەورە بۆ بـەندەکانی حـەق وراستـە لەسـەر مانای حـەقیقی و ئەمـەش ئـەوە ناگەیـەنێت پـەروەردگار ئاوێتـەو تێکەڵاویـە مـەخلوقات ببـێ و هەرگیز ئەم قسەیە ئەو مانا خـراپە ناخوازێ . بۆیە هەر ڕسـتە و ووشەیە بۆ گومـانێك ببەخشـێ -با بۆ خەڵکێکی کەمیش بێت- کە لایـەق نـەبێت بـە خـوای باڵادەسـتەوە واجیبـە خۆمـانی لێ بپارێزین تاوەکو خەڵك گومانی خراپ لەسەر پەروەردگار(ظن السوء )ی بۆ دروست نەبێت .

نمونەی حەوتەم وهەشتەم:

خوای گەورە لـە سـورەتی (ق) لـە ئایـەتی (١٦) دەفـەرموێ﴿ ونحـن أقـرب إلیـه مـن حبـل الورید﴾ واتە ئێمە نزیکترین لە ئادەمیزاد لە شارەگی دڵی خۆی ، و لە سورەتی الواقعـە ئایـەتی (٨٥) دەفـەرموێ ﴿ ونحـن أقـرب إلیـه منكـم ﴾ واتـە خـوای گـەورە ئەفـەرموێ ئێمـە لـە ئێـوە نزیکترین لە مرۆڤەکان ، بەڵام زانایانی سەلەف تەفسیری (أقرب) نزیکتر یان هەر (قـرب) نزیکـی بە گشتی بە نزیکی فریشتەکان (الملائكه) لە مرۆڤەکانـەوە تەفسـیر کـردووە، ئـەم تەفسـیرەش مانای (صرف )و لادان ناگەیەنێت لە زاهیری ئایەتەکان بۆ کەسێك کە وورد بێتەوە لە ئایەتەکان و بابەتی ئایەتەکان کۆبکاتەوە .

سەبارەت بە ئایەتی یەکەم مەبەست پێی نزیکـی فریشـتەکانە لـە مرۆڤـەکان چونکـە پاشـتر ئەفەرموێ ﴿ونحن أقرب إلیه من حبل الورید إذ یتلقی المتلقیان عن الیمین وعن الشمال قعید، ما یلفـظ مـن قـول إلا لدیـه رقیـب عتیـد ﴾ سـورەتی ق ئایەتـەکانی ١٦-١٧-١٨ . واتـە ئێمـە لـە شارەگی دڵی لێی نزیکترین کاتێك دوو فریشتەچاودێرەکەی ئادەمیزاد کە لەلای ڕاست وچەپەوە دانیشتون، هـەموو گوفتـار وکردارێکـی تۆمـار دەکـەن. هـەر قسـەیەکی لـە دەم دەرچێـت خـێرا

...ی فامادە تۆماری دەكات كەواتـە (إذ يتلقـى ) بەڵگەيـە لەسـەر نزيكـی دوو فريشـتە چاودێرەكە.

ئايەتی دووەميش ﴿ونحن أقرب إليه منكم﴾ ئەم نزيكی‌يە وا بەستەكراوە بـە حاڵـەتی گيـان كێشان ونزيك بوونەوە لەمردن ، ديارە ئەوەش كـە نزيكـە لـە ئينسـان فريشـتەی گيـان كێشـان وكۆمەڵەكەيەتی چونكە خوای گەورە لە سورەتی (الأنعـام) ئايـەتی (٦١) دا ئەفـەرموێ ﴿ حتـى إذا جاء أحدكم الموت توفته رسلنا وهم لا يفرطون﴾ واتە :هەتا ئەو كاتەی مەرگ دێت و يەخـە بە كەسێكتان دەگرێت ئەو كاتە ئيتر (فريشتە) رەوانەكراوەكانمان گيانی دەكێشن و لە كـاتێكدا ئەوان لەكار و كردەوەی خۆيان كەمتەرخەمی ناكەن ،هەروەها لە سورەتی (الطور) ئايەتی (١٥) دا ئەفەرموێ ﴿ أم أنتم لا تبصرون﴾ واتـە (يـان ئێـوە نـابينن) ، ئـەم ئايەتانـە بەڵگەيـە لەسـەر نزيكی فريشتەكانە لە جێگاو وشـوێنی ئينسـانەكاندا بـەڵام ئێمـە نايـانبينين ئەمـەش ديسـانەوە دووپاتی ئەوە دەكاتەوە كە مەبەست پـێ‌ی تەنها (فريشتەكانە) چونكە هەرگيز ناكرێ وناگونجێ زاتی پەروەردگار لەمەكان و شوێنی ئينسانەكاندا بێت.

لێرەدا پرسيارێك دروست دەبێت ئەويش ؟ بۆچی خـوای گـەروە ئيضافـەی (قـرب )ونزيكـی دەداتە پاڵ خۆی ؟ بڵێ‌ی ئەو تـەعبير و دارشـتنە مەبەسـت پـێ‌ی مەلائيكـە بێـت؟ لـە وەڵامـدا دەڵێين : بەڵێ خوای گەورە ئيضافـەی (قـرب) ونزيكـی فريشـتەكان دەداتـە پـاڵ خـۆی چونكـە نزيكی فريشتەكان لە...وە بە ئـەمر و فرمـانی خۆيـەتی و ئەمان سـەرباز ونـێردراوی خوای گەورەن لە ئيش وكارەكاندا.

هەر لە قورئاندا لە سورەتی (القيامـە) ئايـەتی (١٨) داهـاتووە مەبەسـت پـێ‌ی مەلائيكەيـە ﴿فإذا قرأنـاه فـأتبع قرآنـه﴾ واتـە جـا كـاتێك ئێمـە دەيخوێنينـەوە تـۆش شـوێنمان بكـەوە لـە خوێندنەوەيدا مەبەستيش بە (قرآناه) خوێندنەوەی جوبرەئيلـە بەسـەر پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە خوێندنەكەی (قرآناه) پاڵ دادەتە لای خۆی ،چونكە جوبرەئـيل – سەلامی خوای لەسەر بێت– بە ئەمر و فرمانی خوا ئەم كارە ئەنجام دەدات ، بۆيە گەر ئيضافـة و پاڵی بداتە لای خۆی دروستە ومانـاكەی بەهێزترە .... وە لە سـورەتی (هـود) ئايـەتی (٧٤)دا

ئەفەرموێ ﴿ فلما ذهب عن إبراهيم الروع وجاءته البشرى يجادلنا في قوم لوط﴾ واتە (جاكاتێك ترسەكە لە دڵی ئیبراهیم پێغەمبەر -سلامی خوای لێ بێت-دەرچوو هێمن بووەوە و موژدەكەشی بۆ هاتبوو ، ئینجا دەستی كرد بە باس كردن وموجادەلە دەربارەی قەومی (لوط) جا ئیبراهیم -سەلامی خوای لێ بێت - كە خوای گەورە ئەفەرموێ (یجادلنا) دیارە باس وموجادەلەی لەگەڵ فریشتەكاندا كردووە نەك خوای گەورە ! چونكە فریشتەكان بە فرمانی خوا دەگەڕێن و لە خۆیانەوە هیچ ناكەن.

نمونەی تۆیەم ودەیەم:

خوای گەورە لە سورەتی (القمر) ئایەتی (١٤)دا دەربارەی كەشتیەكەی نوح -سەلامی خوای لێبێت- ئەفەرموێ ﴿تجری بأعيننا﴾ وە لە سورەتی (طه) ئایەتی (٣٩) دا ئەفەرموێ ﴿ولتصنع على عيني﴾ ئایەتی یەكەم ئەفەرموێ ( لە ژێر چاودێری ئێمەدا لەناو ئەو زریانە سامناكەدا كەشیتەكە دەهات و دەچوو ) لە ئایەتی دووەمدا ئەفەرموێ سەبارەت بە پەروەردەكردنی موسا -سەلامی خوای لێبێت- (تا لە ژێر چاودێری مندا گەورە ببێت). بەڵێ باوەڕمان بەمانای زاهیری وحەقیقی هەر دوو ئایەتەكە هەیە بەڵام داخۆ مانای حەقیقی وزاهیری چۆنە ؟

ئایا دەكرێ بگوترێ ، مانای حەقیقی وزاهیری ئەمەیە كە كەشتیەكە راستەوخۆ لە ژێر چاوی خوای گەورەدا دەڕوات (تجری فی عین الله)؟! ! یا ڕاستە بگوترێ : موسا سەلامی خوای لێبێت لەسەرچاوی خوای گەورە پەروەردە كراوە (يربى فوق عين الله) ؟! ! نەخێر بەڵكو مانا ومەبەستی حەقیقی وزاهیری ئایەتەكە ئەمەیە كە بگوترێ ، كەشتیەكە لە ژێر چاودێری وریعایەتی پەروەردگاردا دەچێت ( تجري وعين الله ترعاها وتكلؤها) هەروەها پەروەردەكردنی موسا -سەلامی خوای لێبێت- لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی پەروەردگاردا بووە ( تربية موسى تكون على عين الله تعالى يرعاه ويكلؤه بها).

ئەم تەفسیرەش زمانی عەرەبی پشتگیری دەكات و قورئانیش بەم زمانە دابەزیوە ئەوەتا لە سورەتی یوسف ئایەتی (٢) دا ئەفەرموێ ﴿ إنا أنزلناه قرآناً عربياً لعلكم تعقلون﴾ واتە بە

ئەفەرموێ ﴿ فلما ذهب عن إبراهيم الروع وجاءته البشرى يجادلنا في قوم لـوط﴾ واتـه (جاكـاتێك ترسـەكە لـە دڵـی ئیـبراهیم پێغەمبــەر –سـلامی خـوای لێ بێـت–دەرچـوو هێمـن بـووەوە و مژدەكەشی بۆ هاتبوو ، ئینجا دەستی كرد بە باس كردن وموجادەلە دەربارەی قەومی (لـوط) جا ئیـبراهیم –سـەلامی خـوای لێ بێت – كـە خـوای گـەورە ئەفـەرموێ (یجادلنـا) دیاره بـاس وموجادەلەی لەگەڵ فریشتەكاندا كردووە نەك خوای گەورە ! چونكە فریشتەكان بە فرمانی خوا دەگەڕێن و لە خۆیانەوە هیچ ناكەن.

نمونەی نۆیەم ودەیەم:

خوای گەورە لە سورەتی (القمر) ئایەتی (١٤)دا دەربـارەی كەشتیەكەی نـوح –سـەلامی خوای لێبێت– ئەفەرموێ ﴿تجـری بأعیننـا﴾ وە لـە سـورەتی (طه) ئایـەتی (٣٩) دا ئەفـەرموێ ﴿ولتصنع علی عیني﴾ ئایەتی یەكـەم ئەفـەرموێ ( لـە ژێـر چـاودێری ئێمـەدا لـەناو ئـەو زریانـە سـامناكەدا كەشـیتەكە دەهـات و دەچـوو ) لـە ئایـەتی دووەمـدا ئەفـەرموێ سـەبارەت بـە پەروەردەكردنی موسا –سەلامی خوای لێبێت– (تا لە ژێر چاودێری منـدا گـەورە ببێـت). بـەڵێ باوەڕمان بەمانای زاهیری وحەقیقی هەر دوو ئایەتەكە هەیە بەڵام داخۆ مانای حەقیقی وزاهـیری چۆنە ؟

ئایا دەكرێ بگوترێ ، مانای حەقیقی وزاهیری ئەمەیە كە كەشتیەكە راستەوخۆ لە ژێر چاوی خوای گەورەدا دەڕوات (تجری في عین الله)؟!! یا ڕاستە بگوترێ : موسا سەلامی خـوای لێبێـت لەسـەرچاوی خوای گـەورە پـەروەردە كـراوە (یربـی فـوق عـین الله) ؟!! نـەخێر بـەڵكو مانـا ومەبەسـتی حـەقیقی وزاهـیری ئایەتەكە ئەمەیـە كـە بگوتـرێ ، كەشـتیەكە لـە ژێــر چـاودێری وریعایەتی پەروەردگاردا دەچێت ( تجري وعین الله ترعاها وتكلؤهـا) هـەروەها پـەروەردەكردنی موسا –سەلامی خـوای لێبێـت– لـە ژێـر چاودێری و سەرپەرشـتی پـەروەردگاردا بـووە ( تربیـة موسی تكون علی عین الله تعالی یرعاه ویكلؤه بها).

ئەم تەفسیرەش زمانی عەرەبی پشتگیری دەكات و قورئانیش بەم زمانە دابەزیوە ئەوەتا لە سورەتی یوسف ئایەتی (٢) دا ئەفەرموێ ﴿ إنـا أنزلنـاه قرآنـاً عربیـاً لعلكـم تعقلـون﴾ واتـه بـه

راستی ئێمە ئەم ئایەتانەمان دابەزاندووە لە شێوەی قورئـانێكی پـاراودا بـە زمـانی عـەرەبی بۆ ئەوەی ئێوە لێی تێبگەن و ژیریتان بخەنە كار ، بەهەمان شێوە لە سـورەتی (الشعراء) ئایـەتی (١٩٥) دا فەرمویەتی ﴿ لتكون من المنذرين بلسان عربي مبين﴾ واتـە بـۆ ئـەوەی خـەڵكی بێدار بكەیتەوە و ئاگاداریان بدەیتێ بە زمـانی عـەرەبی روون وئاشكرا) جـا هیـچ كەسێكیش كـە لـە زمانی عەرەبی شارەزا بێت هەرگیز وا حاڵی نابێت كە بگوترێ (فـلان یسـیر بعینـی) ماناكـەی وا تێبگات كە (یسیر داخل عینه) واته بەناو چاویدا دەروات ودێت !!! یـان كـاتێ بگوتـرێ (فـلان تخرج علی عینی) ماناكەی ئەوە بێت (أن تخرجه كان وهو راكب علی عینه) واتـە دەرچوونـی لـە خوێندن بە شێوەیەك بووە هەمیشە سواری چاوی مامۆستاكەی بووە ؟!!! دیارە هەر كەس وا بڵێ دەبێتە شوێنی پێكەنین وگاڵتە جاڕی خەڵك !!

نمونەی پانزەیەم:

خـوای گـەورە لـە فەرمودەیـەكی (قودسـی) دا كـە پێغەمبـەر(ﷺ) بۆمـانی دەگێڕێتـەوە و فەرمودەیەكی (صحیح)ە وئیمامی بوخاری لە (كتـاب الرقـائق) ی (صحیـح البخـاری) دا تۆمـاری كردووە كە ئەفەرموێ (وما یزال عبدي یتقرب الي بالنوافل حتی أحبـه فـأذا أحببتـه كنـت سمعـه الذي یسمع به وبصره الذي یبصر به ، ویده التي یبطش بها، ورجله التي یمشي بها ولئن سـألني لأعطیتـه ولئـن إستعاذني لأعیذنـه ) واتـە خـوای گـەورە ئەفـەرموێ بەردەوام بـەندەی مـن بـە جێبەجێكردنی سونەتەكان لەمن نزیك دەبێتەوە تا دەبێتە خۆشەویستی مـن، كـە گەیشـتە ئـەو ئاستەی من خۆشم بوێت ئەو كاتە دەبمە ئەو گوێیەی پێی دەبیستێت وە دەبمە ئەو چـاوەی پێی دەبینێت وە دەبمە ئەو دەستەی زەبـری پـێ دەوەشـێنێت ، وەدەبمـە ئـەو قاچـەی هـاتو چۆی پـێ دەكـات، جـا بـەم حاڵەتـەو لەهـەر كـاتێكدا هـەر داوایـەكم لێ بكـات وەڵامـی دەدەمەوەو پێی دەبەخشم وە هەركات پەنام پێ بەرێت پەنای دەدەم. بەڵێ ئەهلی سونەت و جەماعەت و سەلەفی صالح مانای زاهـیری ئـەم فـەرمودەیان وەرگرتـووە لەسـەرمانای حـەقیقی تەفسیریان كردووە بەڵام مانای زاهیری فەرموودەكە كامەیە؟

ئایا ئەمەیە كە بگوترێ خوای گەورە بۆ خۆی دەبێتە چـاو وگـوێ ودەست و قـاچی عـەبدە صالّحەكان؟

یان ئەمەیە كە بلّێین ، مانـای زاهـیر وحـەقیقی ئەوەیـە كـە خـوای گـەورە ڕێ پێشـاندەرەو بەرچاو ڕوونی دەبەخشێتە بیسـتن و بینـین و دەست وقـاچی عـەبدی صالّحـەوە بـە شـێوەیەك هەموو هەست و سۆز وكردار وگوفتارێكی لەبـەر خـاتری خوایـە وبـۆ خـوا دەبێـت وتەنـها لەبـەر ڕەزامەندی ئەو كارەكان ئەنجام دەدات؟

بێگومان ڕاو بۆچوونی یەكەم بـەتاڵ وبـێ بەڵگەیـە و لـە حـەقی خـوای گـەورەدا نـاگونجێ و زاهیری فەرموودەكەش ئەوە ناگەیەنێ بەڵكو ڕاو بۆچوونی دووەم دەسەڵمێنێ لە دوو ڕووەوە،

یەكەم: هەر لە فەرمودەكەدا هاتووە (وما يزال عبدي يتقرب ألي بالنوافل حتى أحبه) پاشـتر ئەفەرموێ (ولئن سألني لأعطينه ، ولئن إستعاذني لأعيذنه) جا گەر بەڕا و بۆچوونی یەكەم بێت، دەبێت لەیەك كاتدا ئینسان عەبد بێت و خوایش بێت واتە(عبد) بێت وهەم (معبـود) !! داواكـەر و داوا لێكراو بێت (سائلاً و مسؤولاً) داوای پەنا وپشتگیری بكـات وخۆیشـی پـەنادەربێت!!!!

واتە گەر قاچ و دەست وچاوی عـەبدەكان ببنـە خـوا بـە هـۆی تێكـەڵ بوونـی پـەروەردگار بـەم ئەندامانەی لاشەی مرۆڤەوە ئەو كاتە چ پێویست دەكات ئەم مرۆڤانە بپارێنەوە لە خوای گەورە و داوای پەنا دانی لێ بكەن؟!!

(مستعيذاً ومسـتعاذاً بـە) ئەمـەش نـەگونجاوە وسـیاقی فەرمودەكـە بـەر پـەرچی دەداتـەوە بەوەی لـە پێشـەوە ئەفـەرموێ( مـا یـزال (عبـدي) پاشـتر ئەفـەرموێ ( ولئـن سـألني لأعطينـە) فەرموودەكە ( عەبدایەتی) ئینسانەكان دەسەلمێنێ وهەم دەسەلآت و زانیاری وسۆز ومیهرەبانی خوای گەورەە بۆیان لەكاتی جێبەجێ كردنی سونەتەكاندا .

كەواتـە چـۆن دەگونجـێ خـوای گـەورە بـۆ خـۆی پارچەیـەكی مـەخلوقات بێـت و لەهـەمان كاتیشـدا وەلآمـی نـزاو داوا وهاواریـان بداتـەوە ؟ چـۆن دەبـێ عـەبدەكان داوا ونـزاو هـاوار لـە پارچەیەكی جەستەی خۆیان بكەن؟!!

دووەم: گویٚ ودەست وچاو وقاچی عـەبدەکان ، بـەش وپارچـە و وەصفـی مـەخلوقێکن کـە ڕۆژێك هەبووە نەبوون وپاشتر هاتونەتە بوون جا هەرگیز هیچ عاقڵێك تێگەشتنی بۆ ئەوە ناچێت کـە خـالقێکی بـە دەسـەڵات و بەدیهێنـەر بـۆ مـەخلوقات بـۆ خـۆی ببێتـە چـاو دەست وقـاچی مەخولقێك ؟! ! بە راستی ئەمە راو بۆچوونێکی هێندە قیزەونە زمـان نـاتوانیٚ بیلێـت ، چ جـای ئـەوەی بگوتـریٚ مانـای حـەقیقی وزاهـیری فەرمودەکەیـە؟! ! پـاك وبێگـەردی بـۆ تـۆ ئـەی پەروەردگارمان هەرگیز ناتوانین سوپاس وشوکرانەبێژی تۆ تەواو بکەین.

نمونەی دوانزەیەم:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لـە فەرمودەیـەکی (قودسیدا) کـە خـوای گـەورە بۆمـان دەگێڕێتـەوە ئەفەرمویٚ ( من تقرب مني شبراً تقربت منه ذارعاً ومن تقـرب مـني ذراعـاً تقربـت منـه باعـاً ومـن أتاني يمشي أتيته هرولة) رواه مسلم في كتـاب الذكـر والدعـاء ورواه البخـاري في كتـاب التوحيـد. مانای فەرمودەکە خوای گەورە ئەفەرمویٚ هەر کـەس بستێك لـەمن نزیـك بێتـەوە بـە عیبـادەت وخواناسی من بە ئەندازەی باڵێك یا مەترێك لەئەو کەسە نزیك دەبمەوە وە هـەر کـەس باڵێك یـا مەترێك لەمن نزیك بێتەوە من چەند مەتر لەو نزیك دەبمەوە وە هەر کەس بـە پیـادە بـەرەو لای من بێت من بە راکردن بەرەو رووی دەچم.

ئەم فەرموودەیە وەك دەقە شەرعییەکانی تر بەڵگەیە لەسەر کردارە ویستیـیەکانی (الافعـال الاختيارية) ی پەروەردگار کە خـوای گـەورە (فعـال لمـا يريـد) هـەر چیـیەکی بوێت دەیکـات ، هەروەك لە سورەتی (البقره) ئایەتی (١٨٦) بە وێنەی ئەم فەرموودەیـە هـاتووە کـە ئەفـەرمویٚ (وإذا سألك عبادي عني (فأني قريب) أجيب دعوة الداعي إذا دعان) واتـە ئـەی محمـد (ﷺ) ئەگـەر بەندەکانم پرسیارت لیٚ بکەن دەربارەم ئەوە من (نزیکم لێیانەوە) بەهانا وهاواری دۆعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپارێنەوە و نزا بکەن.

وە لە سورەتی (الفجر) لە ئایەتی (٢٢) دا ئەفەرمویٚ ﴿ وجاء ربك والملك صفـاً صفـاً﴾ واتـە (پەروەردگارت دێت) و فریشـتـەکانیش پـۆل پـۆل (پێشـتر تەفسـیری ئـەم ئایەتـەمان کـردووە) هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمویٚ ( ينزل ربنا الى السماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر) واتە

پەروەردگارمان (دادەبەزێ) بۆ ئاسمانی دونیا کاتێ یەك بەش لە سێ بەشی شەو دەمێنێ ئەمانە و چەندەها دەقی شەرعی تر کە (قیام الافعال الاختیاریة باللە تعالی) دەسەلمێنن وئەم فەرمودەیەش لەم نمونەی دوانزیەمەدا وەك ئەو دەقە شەرعیانەن.

دیارە ئەهلی سونەت وجەماعەتیش مانای زاهیری ئەم دەقانە وەردەگرن و بە شێوەیەك لایەق بێت بە پەروەردگار تەفسیری دەکەن کە دوور بێت لە (تکیف وتمثیل) چۆنێتی دیاری کردن وهاوشێوە بۆ دانان.

شیخولئیسلام ئیبنولتیمیە -رەحمەتی خوای لێبێت- لە کتێبی (مجموع الفتاوی) ج ٥ لاپەرە (٤٦٦) لە راڤەی فەرمودەی (ینزل ربنا الی السماء الدنیا .....هتد) ئەفەرموێ ( وأما دنوه نفسه وتقربه من بعض عباده فهذا یثبته من یثبت قیام الافعال الأختیاریة بنفسه ومجیئه یوم القیامة ونزوله وإستواءه علی العرش وهذا مذهب أئمة السلف، وأئمة الإسلام المشهورین ،وأهل الحدیث والنقل عنهم بذلك متواتر ) واتە:نزیك بوونەوە ونزیکی پەروەردگار لە هەندێ لەبەندەکانی ئەو زانایانە دەیسەلمێنن کە (الافعال الاختیاریة) بۆ خوای گەورە دەسەلمێنێت و باوەریان وایە خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا دێت بۆ لای بەندەکانی وشەوانە لە ئاسمانەوە دادەبەزێ بۆ ئاسمانی یەکەم و لەسەر عەرشی خۆی بالا دەست وجێگیرە ، ئەمانەش راو بۆچوونی پێشەوایانی سەلەفی صالحی ئێمەن لەگەل هەموو زانایانی فەرمودە ناس (أهل الحدیث) و کەلە زانایانی تری ئیسلام ، ئەم راو بۆچوونانەش جیل لەدوای جیل بە متواتری بە ئێمە گەشتووە.

کەواتە چ بەربەست و رێگرێك هەیە لەوەی کە بلێین خوای گەورە لە بەندەکانی نزیك دەبێتەوە بە شێوەیەك خۆی بیەوێت ولەگەل بەرزی و بلندی خۆیدا بگونجێ ؟ وەچ لەمپەرێك هەیە لەوەی کەبلێین خوای گەورە دێت بۆ لای بەندەکانی چۆن بیەوێت دوور لە دیارکردنی چۆنێتی وهاوشێوەیی (تکییف وتمثیل) لەلایەن ئێمەوە ؟ وە ئایا ئەمە بەلگەی کەمالی دەسەلاتی ئەو زاتە موبارەکە نیە کە هەرچی ویست بە چاکترین شێوە ئەنجامی دەدات کە لایەق بێت بە گەورەیی و دەسەلاتی بێ سنووری خۆیەوە؟

هەر بۆیە هەندێك لە زانایان رایان وایە کە مەبەست لە ڕستەی ( أتیته هرولـة) لـە فـەرموودە قودسییەکەی پێشوودا ، (خێرا بە دەمەوە چوونـی خـوای گـەورە یـە بـۆ بـەندە صالّحـەکانی و قەبولّ کردنی عیبادەتەکان لێی) چونکە ئەم بەندە صالّحە بە دڵ و لاشە روو لە خوا بووە بۆیـە پاداشت و وەلاّمی خوایش بەو شێوە دەبێت.

چونکە هەندێ جار بەندەی صالّح بە ڕۆیشتن بە پیادە بەرەو لای پەروەردگار دەچێـت وەك ڕۆشتنی بۆ مزگەوتەکان وبۆ حەج کردن و جیهاد لە پێناوی خوادا ،هـەندێ جـاریش بـە (رکـوع وسجود) وەك چۆن پێغەمبەر ی خوا (ﷺ) ئەفەرموێ ( أقرب ما یکون العبد من ربه وهو سـاجد ) هەندێ جاری تریش نزیك بونەوەی عەبدە صالّحەکان بە نزاو وپارانەوە دەبێت لـە کـاتێکدا کـە ئینسان (راکشاوە بە پشتا یان بەلادا کەوتووە) وەك لە سورەتی (آل عمـران) ئایـەتی (١٩١) دا ئەفەرموێ ﴿الذین یذکرون الله قیاماً وقعوداً وعلی جنوبهم﴾ واتە ئەوانەی یـادی خـوا دەکـەن لـە کاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاون).

هەروەها پێغەمبەری خـوا(ﷺ) بـە عیمرانـی کـوڕی حەسـین ئەفـەرموێ (صلِّ قائماً فـأن لم تستطع فقـاعداً فـأن لم تستطع فعلـی جُنُـب ) واتـە بـە پێـوە نوێـژ بکـە گـەر بۆت نـەکرا بـە دانیشتنەوە گەر بۆت نەکرا بە ڕاکشانەوە.

کەواتە لێرەدا مەبەست بە نزیك بوونەوەی خوای گـەورە لـە بـەندە صالّحـەکانی و بـە خـێرا راکردن (أتیته هرولة) و هاتن بە دەمیانەوە بریتییە لە وەلاّمدانەوەی خێرایان و بـە شـێوەیەکی چاکتر و باشتر لـە کـردەوەی بەندەکان ئەمـەش لـەو دەقـە شـەرعییانەی سـەرەوە لـە سـیاقی هەموویان بە شێوەی مانای زاهیری لەفزەکان وەردەگیرێ.

نمونەی سیانزدەیەم:

خوای میهرەبان لە سورەتی (یس) ئایەت(٧١) دا ئەفەرموێ ﴿ أو لم یروا إنا خلقنا لهـم ممـا عملت أیدینا أنعاماً ﴾ واتە باشە ئەو خەڵکە سەرنجیان نەداوە کە بەڕاسـتی بەدەسـتی خۆمـان مالاّتمان بۆ دروست کردوون.

لێرەدا دەبێ بپرسین ئایا زاهیری مانای ئایەتەكە ئەمەیە كە خوای گەورە بە دەستی خۆی مەڕ ومالآت دروست دەكات هەر وەك چۆن ئادەمی (سەلامی خوای لێ بێت) دروست كرد بە دەستی خۆی؟

یا خود زاهیری ماناكەی ئەمەیە كە خوای گەورە چۆن بوونەوەری دروست كردووە هەروەها مەڕ ومالآتیشی دروست كردووە ، ئەم دروست كردنەش كاتێ دەدرێتە پاڵ دەست (إضافة العمل الى اليد) مەبەست پێی خاوەنی دەستەكەیە كە پەروەردگارە نەك مەبەستی (دەستی) پەروەردگار بێت ،ئەمەش لە زوبانی عەرەبیدا شتێكی دیارو ئاشكرایە.

هەر بۆیە راو بۆچونی یەكەم مانای زاهیری ئایەتە كە ئاگرێتەوە لە دوو رووەوە:

١- لەفزی ئایەتەكە لەگەڵ سیاق وداخوازی زمانی عەرەبیدا یەكناگرێتەوە كە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە ئەوەتا خوای گەورە لە سورەتی (الشورى) ئایەتی (٣٠) دا ئەفەرموێ ﴿ وما أصابكم من مصيبه فبما كسبت أيديكم ﴾ واتە هەر بەلآ و نەهامەتیەكتان بەسەردا هاتبێت ئەوە دەرەنجامی ئەو كارو كردەوانەیە كەبە دەستت و ئارەزووی خۆتان دەتانكرد) وە لە سورەتی (الروم) ئایەتی (٤١) دا ئەفەرموێ ﴿ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت أيدي الناس ليذيقهم بعض الذي عملوا لعلهم يرجعون﴾ واتە تاوان وخراپە دەركەوتوە وهەموو سەرزەوی و دەریاكانیشی گرتۆتەوە ، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە كە خەڵكی دەستیان داوەتێ سەرەنجام دەبێ تالآوی هەندێك لەكردەوەكانیان بچێژن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی پاكی و خواناسی.

لەم دوو ئایەتی پێشوو (بما كسبت أيديكم) وە ( بما كسبت أيدى الناس) مەبەست ئەو كار و كردەوانەیە كە ئینسان پێی هەڵدەستێت بە گشتی ئیتر بەدەست ئەنجامیان بدات یان بە زمان وچاو وقاچ و باقی ئەندامەكانی لەشی.

ئەمە جیاوازە لەوەی كە ئیسنان بڵێ فلآن كردەوەم بە دەستی خۆم ئەنجام داوە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەنجام دانی ئەو كردەویە بە تەنها (دەستی خۆی نەك باقی تری ئەندامەكانی لەشی وەك لە سورەتی (البقره) ئایەتی (٧٩)دا هاتووە ﴿ فويل للذين يكتبون الكتاب بأيديهم ثم

يقولون هذا من عند الله﴾ واتە وا وەيلا بۆ ئـەو كەسانەى كتێب دەنوسـن بـە دەستى خۆيـان و پاشـان دەڵێـن ئـا ئەمـە لـە لايـەن خواوەيـە ) ئـەم ئايەتـە بەڵگەيـە لەسـەر ئـەوەى راسـتـەوخۆ بەدەستى خۆيان كتێبيان نوسيوە..

٢-ئەگەر مەبەست لەماناى ئايەتەكان ئەوە بێت كە خواى گەورە بـە دەستى موبارەيـەكى مـەڕ ومالاتەكانى دروست كردووە دەبوو لەفزى ئايەتەكە بيفەرمواية ﴿ خلقنا لهم بأيدينا أنعاماً ﴾!!

هـەروەك چۆن خـواى بـالا دەسـت سـەبارەت بـە دروسـت كردنـى ئـادەم - پێغەمبـەر (ﷺ) لە سورەتى (ص) ئايەتى (٧٥) دا ئەفەرموێ ﴿ مـا منعـك أن تسجد لما خلقت بيدي﴾ واتـە ئـەى ئبليس -شەيتان- ئەوە چى نەيهێشت كڕنوش بەريت بۆ ئەو كەسەى كە بەهەردوو دەستى خۆم دروستم كردوە؟

٣-جـا قورئـاينش هۆشيارى دەدات بـە خوێنـەر و زۆر بـەر ڕوونـى مانـا ومەبەستەكان ديـارى دەكات وەك لە سورەتى (النحل) ئايەتى (٨٩) دا ئەفەرموێ ﴿ ونزلنا عليـك الكتـاب تبيانـاً لكل شيء﴾ واتە قورئانمـان بـۆ تـۆ دابـەزاندووە ئـەى محمـد(ﷺ) ، ڕوونكـەرەوەى هـەموو شتێكە ، هەروەها بە پـێى ڕێزمـانى عـەرەبى كـاتێك هـەر كردارێـك پـاڵبدرێت -إضافـة- بـۆ لاى خـودى خاوەنەكـەى و پيتـى (ب ) بڕواتـە سـەر دەسـتى (بيـدى) ئـەوە مانـاى راستەوخۆى ئـەو كـارە دەگەيەنێ بە دەستى خاوەنەكەى .

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێ كە ڕاو بۆچوونى دووەم راست ودروستە وماناى زاهيرى ئايەتەكە ﴿خلقنا لهم مما عملت أيدينا أنعامـاً﴾ مەبەست پـێى قودرەتـى پـەروەردگارە وخـواى گـەورە خۆيەتى نەك دەستى موبارەكى .

نمونەى چواردەيەم:

خواى گەورە لە سورەتى (الفتح) ئايەتى(١٠) دا ئەفەرموێ ﴿ إن الذين يباعونك إنما يبايعون الله يد الله فوق ايديهم﴾ واتە بێگومان ئەوانەى پەيمان دەدەن بە تۆ ئەى محمـد(ﷺ) لـە راستيدا هەر پەيمان بەخوا دەدەن ، دەستى پيرۆز و بەتواناى خوا لەسەر دەستيانەوەيە (بە پشتگيرى و يارمەتى) . ئەم ئايەتە لە دوو رستە پێك هاتووە :

یەكەم:

( إن الذین یبایعونك إنما یبایعون الله) زانایانی سەلەفی صالح ئەهلی سونەت وجەماعەت ئایەتەكە لەسەر مانای زاهیر و حەقیقەتی لەفزەكان تەفسیر دەكەن بەوەی كە ئەم ئایەتە زۆر بە راشكاوی بەیعەتی هاوەڵان بۆ پیغەمبەر(ﷺ) دەسەلمینی و هەروەك لە هەمان سورەتی (الفتح) ئایەتی (١٨)دا دووپاتی دەكاتەوە و ئەفەرموی ﴿ لقد رضی الله عن المؤمنین إذ یبایعونك تحت الشجرة ﴾ واتە بە راستی خوای میهرەبان رازی بووە لەو ئیماندارانەی كاتیك بەیعەت وپەیمانیان لەگەڵ تۆدا ئەی محمد(ﷺ) بەست لە ژێر درەختەكەدا ، بۆ هیچ كەسێكیش ناگونجی لە (إنما یبایعون الله) وا حاڵی بێت كە پەیمان وبەیعەت بە خودی خوای گەورە دەدرێت نەك بە پیغەمبەری خوا ! چونكە نەمانای زاهیری ئایەتەكان وا دەگەیەنێ نە لەسەر ئەرزی واقیعیش وا بووە !! كاتیكیش خوای گەورە پەیمان و بەیعەتی هاوەڵان بە پیغەمبەری خوا پاڵ دەداتە لای زاتی موبارەكی خۆی لەبەر ئەوەیە كە محمد(ﷺ) پەیام هێنەری خوای گەورەیە بە فرمانی خوا داوای پەیمان وەرگرتن دەكات ، وپێغەمبەر بۆ خۆیشی پەیمانی بە هاوەڵان داوە كە جیهاد بكەن لە پیناوی خوادا.

هەر بۆیە گوێ رایەڵی پیغەمبەر(ﷺ) گوێ رایەڵیە بۆ پەروەردگار ئەوەتا لە سورەتی (النساء) ئایەتی (٨٠) دا ئەفەرموی ﴿ ومن یطع الرسول فقد أطاع الله﴾ واتە هەر كەس گوێ رایەڵی بۆ پێغەمبەر هەبێت ئەوە گوێ رایەڵ وەل كەچە بۆ پەروەردگار ، هەر بۆیە پالدانی – إضافة– پەیماندان بە پێغەمبەر بۆ لای پەروەردگار !

١) لەبەر شەرەف و گەورەیی پیغەمبەری خوایە .

٢) دووبارە ریز وحورمەتی پەیمانەكەش .

٣) سەلماندنی پشتگیری خوای گەروەش بۆ پەیمان دەران جاریكی تر.

دووەم:

برگە و رستەی دووەمی ئایەتەكە ( ید الله فوق أیدیهم) ئەمەش لەسەر مانای حەقیقی وزاهیری زانایانی سەلەف تەفسیریان كردووە بەوەی كە دەستی خوای گەورە لەسەر دەستی

پـەیمان دەرانـە ، چونکـە دەسـتی خوای‌گـەورە یەکێکـە لـە سـیفاتەکانی خـواو بـۆ خۆیشـی لەسـەرووی بەندەکانیەوەیـە لەسـەر عەرشـی خـۆی ، بۆیـە دەسـتی خـوا لەسـەر دەسـتی عەبدەکانیەوەیە ئەمەش ماناى راست و زاهیری لەفزەکەیە و هەرگیز ناگونجیّ کەسێك وا حالّی بێت کە مەبەست بە (يد الله فوق أيديهم) دەستی پێغەمبەری خوایـە (ﷺ) چونکـە خـوای گـەورە دەستی _ئیضافة) کردووە و پالّی داوەتە لای خۆی و ئەفەرمویّ (يد الله) پاشـتریش ئەفـەرمویّ (فوق أيديهم) کە دەستی پێغەمبەری خواش یەکێکە لەو دەستانە کە پێکەوە بەیعەتیان داوە ، بۆیە دەستی پێغەمبەری خوا (لەگەڵ) دەستی هاوەلآندایە بۆ بەیعەت دان نەك دەستی (لەسەر) دەستی ئەوان بێت.

نمونەی پانزەیەم:

لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە کە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بۆمـان دەگێرێتـەوە لـە خـوای گەورەوە کە ئەفەرمویّ (يا أبن آدم مَرِضْتُ فلم تَعُدْنِي ) واتە ئەی نەوەی ئادەم –سەلامی خوای لێبێت– نەخۆش کەوتم و تۆ نەهاتی بۆلام.

بەڵێ ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە وئیمامی موسلیم لە باسی (سەردانی نەخۆشدا) هێناویەتی ، ئەفەرمویّ (إن الله تعالى يقول يوم القيامة يا أبـن آدم مرضتُ فلـم تَعُدني ، قـال يـا رب ،كيـف أعودك وأنت رب العالمين ؟ قال أما علِمتَ أن عبدي فلاناً مَرِض فلـم تَعُدْه ! أمـا علمـت أنـك لـو عُدْتَه لوجدتَني عنده ؟!) واتە: خوای گەورە لە رۆژی قیامـەتدا ئەفـەرمویّ ئـەی نـەوەی ئـادەم نەخۆش کەوتم تۆ سەردانیت نەکردم ئینسان لە وەلآمدا ئەلّیّ ئەی پەروەردگار چـۆن سـەردانیت بکەم لە کاتێکدا تۆ پـەروەردگار و بەدیهێنـەری هـەموو جیهانیت ؟ خـوای گـەورەش لـەوەلآمدا ئەفەرمویّ : ئایـا نـەتزانی کـە فلآنـە عـەبدی مـن نـەخۆش بـوو تـۆش نـەچوویت بـۆ لای ! ئایا نەتدەزانی گەر سەردانیت بکردایە منت لەلای دەبینی ؟!.

لێرەدا زانایانی سەلەف بە مانای زاهیری فەرمودەکە کاردەکەن و لایـان نـەداوە بـە (هـەوا و ئارەزوو!) بۆ مانایەکی نەخوازراوی تر ، ئەوەتا خـوای گـەورە بـە روونـی باسـی نەخۆشـی ئـەو بەندەیـە دەکات ، بۆیـە گـەر ئـەو نەخۆشـی‌یەی پـالّ دەدرێـت و (إضافـة) دەکرێـت بـۆ لای

پەروەردگار تەفسیری بكەین بە نەخۆشی عەبدەكە ،هیچ لادانێك لەماناكەیدا روو نادات ، چونكە خوای گەورە خۆی وای فەرمووە و مەبەست پێی عەبدەكەیە ، ئەوەتا خوای میهرەبان لە سورەتی (البقرە) ئایەتی( ٢٤٥) دا كاتێ باسی ماڵ بەخشین دەكات كە عەبدەكان ببیبەخشن بە یەكتر ، دەبینین (إضافة) ی دەكات بۆلای خۆی بۆ ئەوەی زیاتر عەبدەكان هەڵبنێ و سوورتر وتوندتر بەدەم ئەو داوا خواییەوە بچن ، وەك ئەفەرموێ ﴿ من ذا الذي يقرض الله﴾ واتە كێیە ئەو كەسەی قەرز دەدات بە خوای گەورە.

دیارە خوای گەورەش پێویستی بە ماڵ وسامانی عەبدەكان نیە و مەبەست لەو قەرزدانە كۆمەكی وهاوكاری عەبدەكانە لە نێوان یەكتردا لەبەر خاتری خوای پەروەردگار كەواتە بۆ نەخۆشیەكەش كە باسكرا هەروەها یە .. هەر بۆیە دەقی ئەم فەرموودەیە گەورەترین و بەهێز ترین بەڵگەی دەمكوت كەرە بۆ ئەهلی (تأويل) ئەوانەی كە دەقە شەرعییەكانی سەبارەت بە (سیفاتەكانی پەروەردگار ) لەمانای زاهیری خۆی لا دەدەن و (تحريف)ی دەكەن بە بێ بەڵگەیەك لە قورئان وسوننەت.

هەر بۆیە بەم (١٥) نمونەیەی باسمان كرد كۆتایی بەم باسە دێنین و، پێمان وایە بەرچاو ڕوونی باشیان دروس كردبێت و ئەتوانرێ لە ڕوانگەی ئەو نمونانەوە باقی باس و نمونەكانی تر كە مابن ، لەسەر رۆشنایی ئەمانەوە تێگەیشتنی ڕاست و دروستمان بۆیان هەبێت و ئەم بنەما (قاعدە) ناودارەی ئەهلی سونەت وجەماعەت بكەینە سەر مەشق لەم بابەتەدا كە دەڵێت (إجراء آيات الصفات وأحاديثها على ظاهرها من غير تحريف ولا تعطيل ولا تكييف ولا تمثيل ) پێشتریش لە (بنەماكانی تێگەیشتن لە سیفاتدا) بە درێژی باسمان لەم بنەما ناودارە كردووە.

# دوا ووتە

پاش ئەوەی بــە بەڵگــەکانی قورئــان وسـونەت وعــەقڵ ڕاستی ودروسـتی مەزهــەبی ئــەهلی سونەت وجەماعەتمان بۆ سەلمێنرا ، لەوانەیە کەسێك پرسیارمان لیَ بکـات ئایا حوکمـی ئـەهلی (تأویل) لای ئێوە چی‌یە ؟ بەلاتانەوە کافر یا فاسق دەبن بە هۆی ئەو (تأویل) کردنەوەیانـەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: حوکـم دان بـە _کـافر کردن یـا فاسـق دانـان – ئیشـی ئێمـە نی‌یـە ، بـەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ لای خـوای گـەورە و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) چونکـە حوکمـی (کوفـر وفسـق) لـەو حوکمانەیە کە دەبیَ قورئان و سونەت بڕیاری بدەن ، هەر بۆیە پێویستە لەسـەرمان زۆر وورد و بە ئاگا بین و بترسین لەوەی حوکمی کوفر یـا فاسـقی بدەیـن بەسـەر کەسـێکدا مەگـەر قورئـان وسونەت بڕیاریان دا بێت .

دیارە ئەصڵیش لـە ئینسـانی موسـڵماندا چاکێتی و دادپـەروەری ودیـن سـاغی‌یە ، تـا ئـەو کاتەی شتێکی پێچەوانە لەم ئەصڵە بەدی دەکرێت بە پیَ‌ی دەلیلی شەرعی ، ئـەوکات دروسـت نی‌یە (تساهل) و گویَ نەدان بەرامبەری بکریَ و پێویستە بە پـیَ‌ی گوناهەکـەی خۆی و دەلیلـی شەرعیَ کوفر یا فاسقی بدرێت بە سەریدا بەڵام پێویستە هەموومان بزانین کە حوکم دان بەسـەر هەر کەسێکدا بە (کافر بوون یا فاسقی) دوو خەتەری گـەورەو ترسـناك ڕوومـان لیَ دەکـات گـەر حوکمەکە وانەبێت و بیَ بەڵگە ولە خۆوە بوو بێت:

١–درۆکردن بەدەم خوای گەورەوە لەو حوکمەدا ، وە درۆ هەڵبەستن و توانـج وناحـەقی دژ بـەو کەسە کە حوکمەکە دەدرێت بەسەریدا.

٢–خۆ خستنە ناو گوناه و بەڵکو هەمان حوکم (کوفر یا فسق) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسـەی کـە (کوفـر یـان فسـق) دەدات بـە سـەر هـەر کەسێکدا گـەر ئـەو کەسـە وانـەبوو.یـان ئـەو حوکمـە نەیدەگرتەوە ، بە بەڵگەی حەدیسێکی (صحیح) کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە ئەفەرمویَ ( إذا كفر الرجل أخاه فقد باء بها أحدهما ) واتە هەر کـەس بـرا دینیەکـەی خـۆی کـافر بکـات و

بڕیاری كوفری بۆ بدات ، ئەوە گەر براكەی وابوو باشە گەرنا حوكمەكە دەگەڕێتەوە بەسەر خۆیدا و بۆ خۆی كافر دەبێت ! ) پەنا دەگرین بە خوای گەورە.

لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە (إن كان كما قال وإلا رجعت عليه) واتەگەر وا بوو كە ئەو دەڵێ باشە گەرنا دەگەڕێتەوە بەسەر خۆیدا.

هەروەها ئەبوزەڕی غەفاری لە پێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی (ومن دعا رجلاً بالكفر أو قال عدو الله وليس كذلك الا حار عليه) واتە هەر كەسێك بانگەواز بكات بۆ پیاوێك گوایە كوفر ئەنجام دەدات یان كافرە یا خود بڵێت فلان كەس دوژمنی خوایە ، بەلام لە راستیدا وانە بێت ئەوە خۆی وەهایە.

بۆیە پێویست دەكات لەسەر هەر موسڵمانێك پێش ئەوەی بڕیاری (كوفر یا فاسقی) بدات بەسەر هەر كەسێكدا دوو خاڵ هەیە بیزانێت :

یەكەم: بەلگەی قورئان وسونەت لەسەر ئەوەی كە فلانە قسە یا كردەوە هەر كەس ئەنجامی بدات خاوەنەكەی (كوفر یا فسق)ی بەسەردا دەدرێ .

دووەم: ئەو حوكمە (كافری یا فاسقی) كە دەدرێت بەسەر كەسێكی دیاری كراودا دەبێ لەگەل حاڵەتی ئەو كەسەدا بگونجێ واتە مەرجەكانی كافر بوون یا فاسق بوونی تێدا هاتبنە دی لەگەڵ ئەم مەرجانەشدا هیچ مانیع ورێگرێك نەما بێت بۆ كافر بونی ئەو كەسە یا فاسق بوونی واتە: (تحقق شروط التكفير أو التفسيق وتنتفي الموانع) دیارە لە گرنگترین مەرجەكانی كافر بوون یا فاسق بوونیش ئەوەیە كە:

عالم و شارەزا بێت بەوەی ئەم كردەوەیەی ئەو سەری لە كافر بوون یا فاسقیەوە دەردەچێت و ئەوەتا خوای گەورە لە سورەتی (النساء ) ئایەتی ( ١١٥) دا ئەفەرموێ ﴿ ومن يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى ويتبع غير سبيل المؤمنين نوله ما تولى ونصله جهنم وساءت مصيراً﴾

واتە ئەوەش دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بكات ولێی جیابێتەوە لە دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست و دروستی بۆ روون بۆتەوە و ڕێبازێك بگرێتە بەر كە جیا بێت لە ڕێگەو ڕێبازی

ئیمانداران، ئەوە رووی وەردە چەرخێنین بـۆ ئـەو ڕووگـەو بەرنامەیـەی هـەڵی بـژاردووە و ڕووی تێکردووە، لە قیامەتیشدا دەیخەینە ناو دۆزەخەوە و دیسوتێنین کە ئەویش سەرئەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە.

هەروەها لە سورەتی (التوبە) ئایەتی (١١٥) دا ئەفەرموێ ﴿ وماكان الله ليضل قوماً بعد إذ هداهم حتى يبين لهم ما يتقون ، إن الله بكل شيء عليم﴾ واتە هەرگیز خوا کەسانێك گومڕا ناکات دوای ئەوەی کە هیدایەتی داون ، هەتا بۆیان روون نەکاتەوە کە دەبێـت لـەچی خۆیـان بپـارێزن بەراستی خوا بە هەموو شتێك زانایە.

هەر بۆیە زانایانی شەرع زان دەڵێن (لا يكفر جاحد الفرائض إذا كان حديث عهد بالإسلام حتى يبين له) واتە ئەو کەسەی بـاوەڕی بـە فـەرزەکان نـەبێت کـافر نـابێت ئەگـەر هـاتوو تـازە موسـڵمان بـوو بێـت تـا ئـەو کاتـەی بـۆی ڕوون دەکرێتـەوە، ئەمـە یـەکێك بـوو لەمەرجـە هـەرە گرنگەکان .

دێینەوە سەر (موانع الكفر أو الفسق) واتە ئەو ڕێگرانەی لەبەردەم بە کافر دانانی کەسێك یـا فاسق بوونی دەوەستن بەپێ ئیرادە و وویستی ئازادی خاوەنەکەی وەك:

١- کەسێك زۆری لێ بکرێ بە قسە یا کردارێك کە پێی کافر یا فاسق ببێت ئەو کاتە مادەم دڵـی پڕ لە ئیمان بێت ولە ژێر زەخت و زۆردا ئەو کردەوەیە ئەنجام بدات ئەوە کافر نابێت وەك خوای گەورە لە سورەتی (النحل) ئایەتی (١٠٦) دا ئەفەرموێ ﴿ ومن كفر بالله من بعد إيمانه إلا من أُكرِه وقلبُه مُطمئن بالإيمان ولكن من شَرَحَ بالكُفر صدراً فَعليهم غَضَبٌ من الله ولهم عذابٌ عظيم﴾ واتـە ئـەوەی پاشـگەزبێتەوە لـە خواناسـی دوای باوەڕهێنـانی جگـە لەوانـەی کـەناچار دەکرێـن ووشەی کوفر بەسەر زاریاندا بێت لە کاتێکدا دڵیان پڕە لە ئیمان بەڵام ئەو کەسەی دڵی بە کوفر و بێ دینی خۆش کرد بێت ئەوانـە خەشـم وقینـی خوایـان لەسـەرە و سـزای گـەورە وسـەخت و دژواریان بۆ هەیە.

٢-لە حاڵەتێکدا فیکر وهۆشیلای خۆی نەمێنێت ونەزانێت چی دەڵێت ئیتر لەکاتی زۆر خۆشیدا بێت یا لەکاتی زۆر ناخۆشی وتـرس و بیمـدا ،کـارێکی ئـەنجام دابێـت یـا قسـەیەکی کـرد بێـت ،

بەڵگەشمان فەرمودەیەكی (صحیح)ی ئیمامی موسلیمە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێ (لله أشد فرحة بتوبة عبده حين يتوب اليه من أحدكم كان على راحلته بأرض فلاة فأنفلتت منه، وعليها طعامه وشرابه فأيس منها إذا هو بها قائمة عنده فأخذ بخطامها ثم قال من شدة الفرح اللهم أنت عبدي وأنا ربك أخطأ من شدة الفرح) واتە خوای گەورە تەوبە و گەڕانەوەی عەبدەكانی بۆلای خۆی زۆر پێخۆشترە لەو عەبدەی كاتێ لەسەحرا و چۆڵەوانیدا ووشترەكەی لێ وون دەبێت وەهەموو خواردن و ئاو و پێداویستییەكانی لەسەر پشتی بێت و بردبێتی ، لەوەها حاڵەتێكدا كە ئەو ئینسانە بە تەواوی هیوا بڕا و بێت و بڕواتە ژێر سێبەری درەختێكەوە وتەنها رەحمی خوا نەبێت هیچ هیوا و ئومێدێكی بە ژیان نەمابێت لەم حاڵەتە بێ ئومێدی و بێ هیوابیەدا لەناكاو سەر بەرز بكاتەوە وببینێ حوشترەكەی بە خواردن و ئاوەكەوە لەبەردەمیدا پەیدا بوویەوە ئەمیش هەستێ و ڕەشۆكەی بگرێت و لەزۆر خۆشی دەربڕیندا بڵێ ئەی خوایە تۆ عەبد ویەندەی منیت و منیش پەروەردگاری تۆ! دیارە لە حاڵەتی خۆشیدا ئەم هەڵەیە دەكات.!

كەواتە لە حاڵەتی زۆر خۆشی یان زۆر ترس و نارەحەتی كە فیكر وهۆشی ئینسان لە كار دەكەوێت و نازانێ چ دەڵێ ! گەر قسەو كردەوەیەكی كوفرانە یا فاسقانەی ئەنجامدا ئەوە لێی ناگیرێت.

هەر بۆیە شیخولئیسلام ئیبنولتەیمیە –رەحمەتی خوای لێبێت– لە كتێبی (مجموع الفتاوى) ج ١٢ لاپەرە ١٨٠ دا ، ئەڵێت (لەمەسەلەی بە كافر دانانی خەڵكیدا ڕاست وردوست ئەمەیە كە: هەر كەس لە ئومەتی محمد(ﷺ) ئیجتیهاد و كۆشش بكات وخۆی ماندوو بكات و بەراستی بە شوێن حەقدا بگەڕێ بەڵام لەو بە شوێن گەڕانەدا تووشی (خطأ) وهەڵە ببێت ئەوە نابێ بە كافر بزانرێ بەڵكو پێویستە چاوپۆشی لە هەڵەكەی بكرێ بەڵام هەركات بۆی ڕوون بوویەوە كە ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) كامەیەویە ملهوڕی و گوێ پێ نەدان لەو ڕێبازە لایدا و چوویە سەر ڕەچە و ڕێبازی خوانەناسان ئەوە كافر دەبێت ، وە هەر كەس شوێن هەوا و ئارەزووی خۆی بكەوێت وخەم سارد بێت لەبە شوێن حەقدا گەڕان و بەبێ عیلم وزانیاری قسە بكات ئەوە (عاص مذنب) لە خوا یاخی بووەو تاوانبارە و لە وانەیە حوكمی (فاسقی) بدرێت بە

سەریدا ، جاری واش هەیـە هـەر ئـەم کەسـە خـاوەنی چاکـە و(حسـنات) ەو چاکـەکانی بەسـەر تاوانەکانیدا زاڵە و سەردەکەوێ...

دیسـانەوە شیخولئیسـلام –رەحمـەتی خـوای لێبێـت– لـە ج ٣ لاپـەرە (٢٢٩) دا لـە هـەمان سەرچاوەدا ئەفەرموێ : من خۆم و ئەو کەسانەش لە مەجلیسی مندا دانیشـتوون دەزانـن کـەمن لە هەموو کەس زیاتر نەهی و بەرگریم کردووە لەوەی کە زاراوەکانی (کوفر یا فسق یـا معصیـە) بدرێن بە سەر کەسانێکی دیاری کراودا ، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە ئەو کەسـانە ئاگادار کرابنـەوە بە بەڵگەی شەرعی و روونکردنەوەی تەواویان بۆ درا بێت ، لەم حاڵـەتدا بـە پـێی گوناهەکـەیان زاراوەی (کافری یا فاسقی یا لە خوایاخی )یان بەسەردا دەدرێ هەروەها من گوتومە و بڵاویشـم کردۆتەوە کە (خوای گەورە لە هەڵە وناتەواویـەکانی ئـەم ئوممەتـە خـۆش دەبێـت ، ئیـتر ئـەم هەڵەیە (خطأ) ە هەموو مەسەلەکانی (الخبرية والقولية) واتە ئەو ئایـەت و فەرمودانـەی گوتـراون سەبارەت بە حوکمە شەرعیەکان وە مەسەلە کرداریەکان (المسائل العمليـە) واتـە ئـەو رەفتـار و کردارانەی بەندەکان ئەنجامی دەدەن و لەشەرعی خـوادا بریـار و حوکمیـان بـۆ دراوە - جێگـای باسە سەلەفی صالْحیش قسەو باس ورای جیاییان لەسەر ئەم مەسەلانە هەبووە ! بەڵام هەرگیز نەبیستراوە لە هیچ کامیان براکەی تۆمەتبار کرد بێت بە (کوفر یان فیسق یا مەعسیەت).

وە بـەردەوام مـن ئـەوەم روون کردۆتـەوە کـە ئـەوەی لـە سـەلەفی صـالْح و پێشـەوایانەوە هاتووە کە بە شێوەیەکی گشتی و بە بێ دیاری کردن ووتویانە هەر کەس فلانە شت وفلانە شت ئەنجام بدات ئەوە کافر دەبێت ئەمە قسەیەکی راستە بەڵام پێویستە ئێمـە جیـاوازی بخـەین لـە نێوان (الأطلاق والتعيين) واتە قسە وحوکمی گشتی و حوکمی تایبەت بەسـەر خـەڵکی تایبـەتیدا ››› چونکە (تكفير) هەرەشە لێ کـردن و ترسـاندنە ئەمـەش کـارو فرمـانی پێغەمبەرانـە و بـەدرۆ خستنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە دەبێ بە پەلە و لـەخۆەوە خـەڵك کـافر نەکـەین چونکە لەوانەیە ئەو کەسە تازە موسڵمان بوو بێت یا لە سەحرایەکدا ژیا بێت بەرنامەی ئیسلامی پێ نەگەشتبێت بۆیە ئەم کەسە کاتێ ئینکاری هەر حوکمێکی شەرعی بکات کافر نابێت چونکـە شارەزایی نیـیە و (إقامة الحجة)ی لەسەر نەکراوە یان لەوانەیە شارەزابێت لە ئیسـلام بـەڵام ئـەو

دەقە شەرعیەی نەبیستبێت یا بیستویەتی بەڵام (صحیح) نییە بەلایەوە یا خود دەقێکی شەرعی تری بەدەستەویە پێچەوانەی ئەمەی ئێستا بۆیە ناچار بووە (تأویل )بکات با خۆی بە هەڵە و (مخطئ) یش بزانێت.

وە من بەردەام ئەو فەرمودە (صحیح)ەم لە یادە کەلە صەحیحی (بوخاری و موسلیمدا) هاتووە لەسەر زمانی پیاوێك کەلەکاتی سەرە مەرگ وگیان دەرچوونیدا وەسیەت دەکات و دەڵێت ( إذا أنا مِتّ فأحرِقوُني ثم إسحقوُني ثم ذَروني في اليمّ، فوالله لَئِنْ قدر الله عليّ ليعُذبني عذاباً ما عذبه أحداً من العالمين ، ففعلوا به ذلك ، فقال الله ما حملَك على ما فَعلتُ قال خشيتك فغفر له) واتە کاتێ کە من مردم لاشەکەم بسوتێنن و پاشان بیکەنە خۆڵەمێش و فرێم بدەنە ناو چاڵێك چونکە بەخوای گەورە قەسەم گەر خوا دەسەڵاتی هەبێت بەسەرمدا زیندووم بکاتەوە سزایەکم دەدات لە جیهاندا کەس سزای وای نەچەشتبێت ، پاشان خزمان و دەور بەریشی هەستان وایان لێ کرد پاشتر خوای گەورە پێی فەرموو: چی وای لێکردیت کە ئەو وەسیەتە بکەیت و وات لێ بکەن؟ لەوەڵامدا ووتی : خوایە تەنها ترسان لە تۆ، بۆیە خوای میهرەبان یەکسەر لێی خۆش بوو.

لێرەدا ئەوەی جێگای هەڵویستەیە ئەمەیکە ئەم پیاوە گومانی هەبووە لە دەسەڵاتی پەروەردگار و بەڵکو بیر و باوەریشی وابووە کە زیندوو نابێتەوە گەر لاشەکەی بکرێتە خۆلەمێش چونکە دەڵێ (لئن قدر الله على) ئەگەر خوا دەسەڵاتی هەبێ بەسەرمدا!

ئەم گومان و بیروباوەرەش بەلای هەموو زانایانەوە کوفرە، بەڵام دیارە ئەم پیاوە شارەزا نەبووە لە پایەکانی بیرو باوەڕ و نەیزانیوە کە ئەو بیروبۆچوونە کوفرە لەگەڵ ئەو نەزانیەشدا باوەڕی بە خوای گەورە هەبوە زۆریش ترساوە لە سزای پەروەردگار و هەر ئەو ترسەش پاڵی پێوە ناوە ئەو وەسیەتە بکات بۆیە خوای گەورە لەبەر ئەو نەزانیەی نەك هەر ئیشکەی بە کوفر بۆ تۆمار نەکردووە بەڵکو خۆش بووە لێشی. جا ئەو کەسەی لە ئەهلی ئیجتیهاد و بە شوێن راستیدا گەران با (تأویل) یش بکات مادەم سوور بێت لەسەر بەدوادا چوونی پێغەمبەر ( متابعة الرسول(ﷺ)) لە پێشترە (اولى بالمغفرة من هذا) لە لێخۆش بوونی لەو پیاوەی سەرەوە .

هەر لێرەوە بۆمان روون دەبێتەوە كە جیاوازى هەیە لـە نێـوان ووتـەو خاوەنەكـەیدا (القـول والقائل) وە لە نێوان كردار و بكەرەكەیدا (الفعل والفاعل) مەرج نىیە هەموو قسەیەك یا كردارێك كوفر یا فیسق وتاوان بێت و خاوەنى ئەو (قسە ، یان كردەوەیە) حوكمى كـافر یـا فاسـق بـوون بدرێت بەسەریدا ئەمەش ڕا و بۆچوونى شیخولئیسلام ئیبنولتەیمیە -ڕەحمـەتى خـواى لێبێـت - لە كتێبى (مجموع الفتاوى) ج ٣٥ لاپەرە ١٦٥ وەرگیراوە.

سەرچاوە و بناغەى ئەم قسانەش ئەوەیە كە هەر قسەیەك لـە قورئـان و سـوونەتو ئیجمـاعى زانایاندا بە (كوفر) دابـنرێت ، دەبـێ بگوتـرێ كـە ئـەو قسـەیە (كوفـرە) بـە شـێوەیەكى گشـتى چونكە مەسەلەى ئیمان لەو بابەتە گرنگانەیە كە لە خواى گەورە و پێغەمبەرەوە پێمان گەشتووە هەرگیز ناكرێ خەڵك بە گومان و هـەواو ئـارەزووى خۆیـان قسـەى تێدا بكـەن و بڕیـارى لەسـەر بدەن ، بەڵام دروستیش نىیە بۆ هیچ كەسێك كاتێ كەسێكى بینى قسـەیەكى بـێ باوەڕانـە یـان كوفرانە دەكات یەكسەر پێى بوترێ ئەوە كافرە ، مەگەر مەرجـەكانى كـافر بـوون و ڕێگرەكـان (الموانع)ى تێدا هاتبنە دى ، ئەو كاتـە بڕیـارى كـافر بوونـى لەسەر دەدرێـت ، بـۆ نمونـە گـەر كەسێك باوەڕى وا بێت كە عارەق و سوو (الربا) حەڵاڵن ،لەبەر ئەوەى تازە موسڵمان بووە یا لە سەحرا و چۆڵەوانیدا ژیاوە وحوكمى شـەرعى عـارەق و سـووى نەبیسـتووە بۆیـە گـەر قەناعـەت وباوەرى وا بوو كە حەڵاڵن و لـە قورئـان و سونەتیشـدا باسـیان بـە حـەرامى نـەهاتووە ، ئـەوە مادەم تازە موسڵمان بووەو نـەزان و نەشـارەزایە بـە وحوكمـە شـەرعیانە ئـەوە كـافر نـابێت! هەروەك چۆن هەندێك لە زانایانى سەلەفى صالح لە كاتى خۆیانا ئینكاریان لە هەندێ فەرمودەى پێغەمبەر (ﷺ) كردووە چونكە ئـەو فەرمودانـەیان پـێ نەگەیشـتووە یـان بـەلایانەوە (صحیـح) نەبووە ، بۆیە هیچ یەكێك لەوانە بە كافر دانانرێن هەتا (إقامة الحجـة) بەڵگـەى ڕوون و تـەواویان لەسـەر تۆمار نەكرێت ، وەك خواى گەورە لە سـورەتى (النسـاء) ئایـەتى (١٦٥)دا ئەفـەرموێ ﴿ لئلا یكونَ للناس على الله حُجة بعدَ الرُسُل ﴾ واتـە تـا خـەڵكى هیچ بەڵگـەیان بـە دەسـتەوە نەمێنێت (لەسەر بێ دینى و یاخى بوونیان) دواى ئەوەى خـوا پێغەمبـەرانى بـۆ ڕەوانـەكردون ،

خوای گەورەش لە هەموو هەڵە و لە بیر چوونەوەیەك (الخطأ) والنیسان) كە ئەم ئوممەتە ئەنجامی بدات لێیان خۆش دەبێت.

لێرەدا كۆتایی دێینن بە قسە شیرین و بەڵگەدارەكانی شیخولئیسلام.

لەم فەتوا و قسە بەهێز و بەڵگە دارانەی شیخولئیسلامەوە بۆمان دەركەوت كە قسە و كردەوە جاری وا هەیە (كفر یا فسق )ە بەڵام مەرج نییە ئەو كەسەی كە پێیان هەڵدەستێت (كافر یا فاسق) بێت لەبەر (لأنتفاء شرط التكفیر أو التفسیق أو وجود مانع یمنع منه)

وە هەر كەسێك حەق و راستی بۆ دەركەوت و بەڵام هەر پێچەوانەو دژایەتی كرد ئیتر لەبەر قەناعەت وبیرو باوەرێك بێت یا كەسێك و بەرنامەیەك هەبێت وای لێكردبێت یان لەبەر خۆشەویستی دونیا و فەزڵ دانی بەسەر قیامەتداوا بكات ، لەبەر هەر یەكێك لەمانە بێت بە پێی جۆری تاوان و گوناهەكە و گەورە و بچوكیەكەی وڕێژەی پێچەوانە و دژایەتیەكەی حوكمی (كوفر یا فیسق)ی بەسەردا دەدرێت.

بۆیە لەسەر هەموئیماندارێك پێویستە بیرو باوەڕ و قسە و كردوەكانی بە پێی قورئان و سونەت بەرنامە ڕێژی بۆ بكات و تەنها قورئان وسونەت بكاتە پێشەوا و ئیمامی خۆی و لە بەر تیشك و رووناكی ئەم دوانەدا بەرنامەكانی ژیانی رێك بخات ، تەنها بەم شێوەیەش ڕێبازی (الصراط المستقیم) دەتوانێ بگرێتە بەر كە خوای گەورە فرمانی پێ كردووین تەنها لەسەر ئەو رێبازە برۆین وەك لە سورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٥٣) دا ئەفەرموێ ﴿ وأن هذا صراطي مستقیماً فأتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبیله ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون ﴾ واتە بێگومان ئەمە رێباز و شارێی ڕاستی منە وئێوەش دەبێ شوێنی بكەون ، و شوێنی رێچكەكانی تر مەكەون ، چونكە جیاتان دەكاتەوە لە رێبازی خوا ئەمەش پەروەردگارتان فەرمانی پێ كردوون بۆ ئەوەی خواناس و پارێزگار بن.

لە كۆتایدا خاڵێكی تر بە گرنگ دەزانین و پێویستە موسڵمانان لێی ئاگادار بن ئەویش ئەمەیە كە ، هەندێك دەبینین هەموو بیرو باوەڕ و كردەوەیەكی لەسەر مەزهەبی زانایەكی تایبەت بەرێوە دەبات و گەر دەقەكانی قورئان و سونەتیش پێچەوانەی ئەو مەزهەبەبن هەوڵ

دەدات مانا و مەبەستی ئەو دەقانە بگۆڕێ و وەها تەفسیریان بکات کە لەگەڵ مەزهەبەکەی خۆیدا بگونجێ! بەم شێوەیە قورئان سونەت دەکاتە پاشکۆ و شوێن کەوتەی مەزهەب .

دیارە ئەمەش ڕێگەیە کە لە ڕێگەکانی شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو نەك شوێن کەوتنی هیدایەت ، بۆیە خوای میهرەبان زەمی ئەو کۆمەڵانە دەکات و لە سورەتی (المؤمنون) ئایەتی (٧١) دا ئەفەرموێ ﴿ ولو أتبع الحق أهواءَهم لفسدَت السموات والأرض ومَنْ فيهن بل أتيانهم بذكرهم فهم عن ذكرهم معرضون﴾ واتە : ئەگەر حەق و ڕاستی شوێنی ئارەزووی ئەوان بکەوێت، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی تێیاندایە دەشێوا و تیادەچوو ، نەخێر حەق وایە رقیان لێی نەبێت چونکە ئێمە قورئانێکمان بۆ هێناون کە یادی هەموو چاکەکانیان بخاتەوە ، کەچی ئەوان لە بەرامبەر ئەو یاد خەرەوانەدا سەرکەش و یاخین وپشتی تێ دەکەن.

ئەوەش سەیری نوسراو و ڕاو بۆچوونی ئەو هەندە خەڵکە بکات ،شتی سەیر و سەمەرە دەبینێ و ئەو کاتە بۆی دەسەلمێ کە شوێن کەوتنی قورئان وسونەت و تەسلیم بوون بە ڕاستیەکانیان چەند تام و چێژ ودڵ ئارامی بە خاوەنەکەی دەبەخشێت و بیرو هۆشی موسڵمانان کۆ دەکاتەوە،و مەزهەبی زانایانی ئیسلام خزمەتکار و ئاسانکاری دەکەن بۆ موسڵمانان کاتێکیش ڕاو بۆ چوونی هەر زانایەك پێچەوانەی هەر دەقێکی شەرعی سابت بێت. ئەو زانا بەرێزە خۆی پێش هەموو کەس لێی پەشیمانە ، وە لەسەر زمانی هەموویانەوە ئەم وتە بە نرخەمان بۆ هاتووە کە دەفەرمون ( إذا صح الحديث فهو مذهبي) واتە حەدیسی صەحیح مەزهەبی هەر یەکێك لە ئێمەیە و قورئان و سونەت سەرچاوەی یاسادان و هەڵێنجانی هەموو مەزهەب و فەتواکانن نەك بە پێچەوانەوە !!

بۆیە هەر کەسێك بپاڕێتەوە لە خوای میهرەبان بە دڵێکی پاك و ڕاستگۆیانەوە و هەست کردن بە دەوڵەمەندی پەروەردگار و هەژاری خۆیەوە ، بێگومان خوای میهرەبان وەڵامی دەداتەوە و داواکاریەکانی قەبوڵ دەکات ، هەروەك لە سورەتی (البقرە) ئایەتی( ١٨٦) دا ئەفەرموێ ﴿ وإذا سألك عبادي عنّي فإني قريب أُجيب دعوةَ الداعِ إذا دعان فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون ﴾ واتە : ئەی محمد(ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن

دەربارەم ، ئەوە من نزیکم لێیانەوە ، بەهانا و هـاواری دۆعـا گۆیانـەوە دەچـم هـەر کـاتێك لێـم بپارێنەوە ونزا بکەن ، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگـەوازی منـەوە بێـن و بـاوەڕی دامـەزراو بـە مـن بهێنن ، بۆ ئەوەی ڕێگای هوشیاری و ئاگایی بگرنە بەر.

لێرەوە لە خوای بالآدەست ئەپاڕێینەوەکە لەو کەسانەمان بگێڕێ حەق ناسن و شوێن حـەق دەکـەون وە بـە تـالْ وپـڕ وپووچیـش ، بـە بـەتالْ دەبینـن و لێ ی دوور دەکەونـەوە هـەروەها بمانگێڕێ لەو کەسانەی کە بانگخواز وڕێ پێشاندەرن و بۆ خوا صولْحاون ، خوایە بە میهرەبانی خۆت دڵەکانمان ڕوو لە هیدایەت بکە تا نەلە خشاو و جێگیر دەبن .

لە کۆتاییدا دەڵێین: خوایە لەبەر خاتری سیفاتە بەرز و بڵندەکان و ناوە جوانەکانی خـۆت ، کە ئەم نوسراوەمان دەربارەیان نووسـی لـە مامۆسـتای نوسـەر و وەرگـێڕ و سـەرجەم خوشـك وبرایانی موسڵمان خۆش بیت و ئەم نوسراوەش بخەیتە تەرازوی چاکەکانمان .

اللهم آمین

هەمیشە و هەمووکاتیش بە (الحمد لله رب العالمین ) کۆتایی بەکار و کردەوەکانمان دێنین

# پێرستی باسەکان

